# سادقی هیدایەت نموونەی مەرگی نووسەر

**نووسین و گۆڕینی: حەمەکەریم عارف**

-١-

هەڵبەتە سەبارەت بە دەقی داهێنراوی ئەدەبی، دەبێ ئەوە رەچاو بکرێت کە نووسەر، دەق، رەخنەکر و خوێنەر پەیوەندییەکی ئۆرگانیان پێکەوە هەیە و لە حاڵی کارلێکدان و هەر یەکێك لەو لایەنانە نەخش و دەوری خۆی لە پێکهاتەی بەرهەم یان دەقەکەدا هەیە و بە زمانی تازەی رەخنەیی دەبێ بگوترێ کە هەر یەکێك لەو لایەنانە تاچ ئەندازەیەك بەرهەمە کە دەنووسێت یان دەقەکە دەخوڵقێنێ. بۆ وێنە بەلای ئەلیوت -ەوە (خوێنەر بە هەمان ئەندازەی خودی شاعیر مانای شیعرێك دیاری دەکات). هەڵبەتە ئەمە بۆ چوونێکی تازەیە و زۆر جیاوازە لە بۆ چوون و میتۆدە رەخنەییەکانی پێش خۆی.. جاران توێژەران و رەخنەگران، بە تایبەتی ئەوانەی کە (ناوەرۆك) و (فورم)- یان لێکدی دادەبڕی و لایەنی ناوەڕۆکیان لەسەر حیسابی فۆرم دەگرت، یئحتوبارێکی ئەوتۆیان بۆ زمان وەکو لایەنێکی دەق دانەدەناو زمانیان بە هۆیەك لە هۆیەکانی دەربڕینی ئەدەبی دادەنا کە گوایە هیچ رۆڵێکی لە دیاریکردنی ناوەڕۆکدا نییە. بەڵام تیۆری بونیادگەری – لەسەر بنەمای تیۆری زمان ناسی فەردینان دوسوسور – تەقریبەن سەلماندی کە زمان دەورێکی کارای لە دیاریکردنی مانا و نێوەڕۆکی بەرهەم و دەقی ئەدەبیدا هەیە، و لەم بارەیەوە زێدەرۆیش کراوە. بەهەر حاڵ ئەگەر ئەم شۆڕشە زمانەوانییەی سوسوریش پەیدا نەبووایە، دیسان بۆچوونی ناوەڕۆك بازان، بە تایبەتی توندڕەوەکان، پەسند نەدەکرا، چونکە لە هیچ دیاردەیەکدا فۆرم و ناوەڕۆك بە تەواوەتی قابیلی لێکدی جیابوونەوە و جیاکردنەوە نین..

جا بابێینەوە سەر مەبەستی خۆمان، ئەوەی بەرهەرمێکی ئەدەبی لە بەرهەمێن مێژوویی یان سیاسی یان کۆمەڵناسی و یان... جیادەکاتەوە (ئەدەبییەتی) ئەوە بەرهەمەیە، جا ئەو (ئەدەبییەتە)ش لەوێوە پەیدا بووە کە ئەدەبیات بە زەبری (ئەوزار) یان (فەند)ی تایبەتی خۆی دەبووە مایەی ئەوە کە بابەتەکەی، مانا و ناوەڕۆکەکەی (ناباو) بێ، واتە روون و ئاشکرا نەبێ، تەنیا لەم رێگەیەوە بەرهەمێن خاڵیسە و بێ غەل و غەش چێ دەبوو بۆ وێنە ئەگەر بەرهەمێك تەنیا دەنگدانەوەی بیروبۆچوون و باوەڕێن نووسەرەکەی بێ، یان نمایندەی رووداووە دیارە باوە کۆمەڵایەتییەکان بێ، ئەگەر لە ئەنجامدانی ئەو مەبەستانەشدا سەرکەوتنی بە دەست هێنابێ ناچێتە خانەی بەرهەمی ئەدەبی خاڵیسەوە.

بەڵکو دەشێت بچێتە خانەی بەرهەمی بیوگرافی، ئۆتوبیوگرافی، کۆمەڵناسی و ئەو شتانەوە کە بە هەندێ کەرەستەی ئەدەبی (بۆ وێنە: کێش و قافیە) رازێنرابێتەوە.

هەڵبەتە ئەم بۆچوونە پاشان لە ئەنجومەنی زمانەوانی پراگدا (کە یاکوبسن دیارترین ئەندامی بوو) پەیگیری کرا، و پاشتر لەگەڵ پەیدابوون و دەرکەوتنی بونیادگەری و هەڵوەشاندنەوەگەرییدا – هەڵبەتە بە زمان و شیکردنەوەی پێشکەوتووتر – گەییە لوتکە خۆی.. کە لەم میتۆدەدا بایەخ و گرینگی نووسەر و هاندەرەکانی نووسەر بەرادەیەك لە توێژینەوەی بەرهەمێکدا کەم دەبێتەوە دەگاتە رادەی سڕینەوە و نەمان و بەمەش دەگوترێ مەرگی نوسەر هەڵبەتە (مەرگی نووسەر) ناوی یەکێك لە گوتارەکانی رۆڵان بارت – ە کە بە ووردی لەو مەسەلەیە دەکۆڵێتەوە. واتە هەر کە پرۆسەی نووسین دەست پێدەکات ئیدی پەیوەندی نێوان خوێنەر و نووسەر دەپچڕێ و نووسەر لە مەرگی خۆی نزیك دەبێتەوە. رۆلان بارت دەڵێت بەر لە رینیسانس کەسایەتی نووسەر لە ناوا نەبوو، بەڵکو (گوتیار) کارەکەی ئەوی نیشاندەدا و دەخستە روو. لێ لەوە بەدواوە، واتە لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمی رینیسانسدا ئیدی تایبەتمەندییەکانی نووسەر و ژینگەی نووسەر لە هەڵسانگاندن و توێژینەوەی بەرهەمی نووسەردا، گرینگییەکی زۆریان پەیدا کرد و لە ئەنجامی دەقی ئەدەبی هەر نووسەرێك لەبەر رۆشنایی رەوشت و رەفتار و راو بۆچوون و باری دەورونی و لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی خودی نووسەردا دەخرایە بەر شرۆڤە و هەڵسانگاندن و لێکدانەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە نەك هەر دەسەڵاتی نووسەر بەڵکو دەسەڵاتی رەخنەگریش بچەسپێ و هیچ دەورێك بۆ خوێنەر لە دیاریکردنی ناوەڕۆکی بەرهەمەکە (دەقەکە) نەمێنێ، واتە چەسپینی دەسەڵاتی نووسەر و روخنەگر لەسەر حەساوی خوێنەر بوو، چونکە کاتێ کە تایبەتمەندی شەخسی و کۆمەڵایەتی نووسەر لە ناوجەگەری دەقەکەدا حەسا و بکرێ، هەنگینێ مێژوونووسی ئەدەبی، توێژەری ئەدەبی و رەخنەگری ئەدەبی، کە لە خەڵکانی دیکە پتر ئاگاداری ئەو تایبەتمەندییانەی نووسەرن، رۆڵی (رونکەرەوەی) دەقەکە دەبینن بە گوتەیەکی دیکە رەخنەگر دێ بە خوێنەر دەڵێ کە (مەبەستی) نووسەر لە دەقەکەیدا ئەم یان ئەو شتەیە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەگەر نووسەر و تایبەتمەندییەکانی نووسەر وەلابنرێن، ئیدی مەسەلەی رونکردنەوە و شرۆڤە، بەتاڵ دەبێتەوەو ئەو بایەخەی نامێنێ.

بەمجۆرەیە کە نووسینێك وەکو یەکەیەکی یەکپارچە دەردەکەوێ و تەجەلی دەکات چونکە هەر دەقێك لایەنی جۆراوجۆری هەیە کە رەگی دەچێتەوە سەر گەلێك سەرچاوەی رۆشنبیریی.. تاقە خاڵێك کە لایەنە هەمە جۆرەکانی دەقێك کۆبکاتەوە و بگرێتە خۆ خوێنەرە – نەك نووسەر وەکو تا ئێستا باو بووە – خوێنەر بریتییە لە هاماج و کەش و هەوایەك کە هەموو ئەو دەستەواژانە دەگرێتە خۆ کە دەقێك یان نووسینێك پێك دەهێنن، بێ ئەوەی هیچ یەکێك لەو دەستەواژانە لە دەست بچن.

لە روانگە کلاسیکییەکەوە نووسەر بەر لە بەرهەمەکەی هەیە: نووسەر دەخوێنێتەوە، فێر دەبێ، تاقی دەکاتەوە، رەنج دەبات و لە ئاکامدا بەرهەمەکەی چێ دەبێ. واتە پەیوەندییەکی زەمانی – مێژوویی لە نێوان نووسەر و دەقی نووسینەکەیدا هەیە وەکو ئەوەی نووسەر باوك بێ و نووسینەکە فەرزەند بێ، یان نووسەر نیهاد بێ و نووسینەکەی گوزارە، بەلام لە روانگە و بۆچوونی تازەی ئەدەبییەوە، لەبەر هەمێن تازەی رۆژگاری ئێمەدا ئەم مەودا زەمانییە لە نێوان نووسەر و دەقدا نییە، ئیدی دەق ئەو بەرهەمە نیە کە پاش ساڵانێك لە کارو کۆشش لە بۆتەی ئەزموونی تاکێکەوە پەیدا بووبێ و هەڵقوڵابێ، بەدەستی ئەو (نووسەر) مشت و ماڵ درابێ، وەکو

راپۆرێك له لایەن ئەوەوە عەرز كرابێ. نووسین، ئیدی – جگە لە زمان، کە لە زمانەوانی تازەدا، هەر سەرچاوەیەك یان سەرەتایەکی دی ڕەت دەکاتەوە – هیچ سەرچاوە و سەرەتایەکی دیکەی نییە، نووسەر ئێستا هەیە و نووسینەکەش هەنووکە دێتە نووسین. لە ڕاستیدا نووسەر زیاتر سەیری بەرهەم دەکات تا بینووسێت. (یەکێتی دەقێك لە دەست پێکیدا نییە بەڵکو لە مەخسەد و مەبەست و ئامانجیدایە) واتا یەکێتی لەوێدا نییە کە لێیەوە دەست پێدەکات، بەڵکە لەوێدایە کە پێی دەگات. کەواتە یەکێتی بەرهەمێك لە خوێنەردا بەرجەستە دەبێت نەك لە نووسەردا. بەڵام ئەم مەبەستە – ئەم خاڵەی کە دەق دەیگاتێ – شەخسی نییە، چونکە خوێنەر بەواتای گشتی وشە، تاکێکی تایبەت و دیاریکراو نییە، و ژیاننامە و چین و باری سایکۆلۆژی و دەروونی تایبەتی نییە. بەڵکو تەنیا فاکتەرێك – ـە کە لە یەك بنکەدا، لە یەك خاڵدا هەر هەموو ئەو ڕەگەزانە کۆ دەکاتەوە کە دەقێکیان پێك هێناوە. (ڕەخنەی کلاسیك هەرگیز بایەخی بە خوێنەر نەداوە و بە هەندی نەگرتووە، لە ڕوانگەی کلاسیکەوە نووسەر تاقە کەسی (کارا و کاریگەر و دیاریکەرە) لە ئەدەبیاتدا... جا بۆ ئەوەی ئایندەی نووسین دروست بکەین پێویستە ئەفسانەی (نووسەر) سەرنگون بکەین: دەبێ لە دایکبوونی خوێنەر بە بەهای مەرگی نووسەر بێ.)

دیارە ئەم ڕوانگە و بۆچوونە، لە بنەڕەتدا لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە دەستی پێکردوە و لە ئاخر و ئۆخری سەدەی بیستەمدا – بە تایبەتی لە بواری تێوری ئەدەبی بونیادگەری و بونیادشکێنیدا – گەییوەتە لوتکەی خۆی و تەواو ڕەواجی پەیدا کردووە و برەوی سەندووە و بووە بە مۆدی ڕۆژ و هەڵبەتە پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە هیچ برە و سەندنێك تا سەر نامێنێ و .. هیچ هەقیقەتێك بە دەقی خۆیەوە نامێنێ و لە ناو پرۆسەی گۆڕاندا دەگۆڕێ، و هەر کۆنێکی ئەمڕۆکەش بگری تازەی دوێنێ بووە، هەر تازەیەکی ئەمڕۆکەش دەبێ بە کۆنەی سبەینێ و هیچ دیاردە و ڕوداوێك لەم سوننەتەی ژیان ناخەڵەسێت و دەرباز نابێت.

بەم پێیە و لەبەر ڕۆشنایی بۆچوونەکانی ڕۆلان بارتدا ئەوەمان بۆ ساغ دەبێتەوە تا ڕۆشنبیریی و ئەدەبیات لە کۆمەڵگەدا بەرینتر و گشتی تر بێ، واتا دیموکراتیك تر بێ، دەوری ڕێژەیی وەرگر و خوێنەر (واتە تێکڕای مەردم) لە پێکهێنان و پێناسەی ئەدەبیاتدا پتر دەبێ و ڕۆڵی نووسەر کەمتر دەبێ. **لە کۆمەڵگەی سەرەتاییدا ئەدەبیات بە ڕێژەیەکی زۆر (جەماوەری)یە، یانی زیاتر لە داستان و ئەفسانە و شیعر و مەتەڵ و ئاواز و گۆرانی عامیانەپێکهاتووە، لە حاڵەتی وەهادا ئەدەبیات (خاوەن) و (دانەر) و (بێژەری) دیار و ئاشکرای نییە، بەڵکو لە ڕێگەی نەقڵ بێژ و گوتیار و شایەرانەوە دەگەیەنرێتە خەڵکی.**

لێ کاتێ لەسەر بناغەی هەمان ئەو نەقڵ و سرود و داستان و ئەفسانانە.. بەر هەمێن حەماسی و لیریکی و وەسفی و ئەو شتانە هاتە ڕۆنان و تۆمار کران، ئیدی خاوەنەکانیان لە عەوامی خەڵك و هەروەها لە نەقڵ بێژان و شایەران و سروود بێژان جیاکرانەوە و هاتنە ناسین. ئەوەبوو بەرهەمێن ئەدەبی بەناوی هومەر و سوفوکلیس و بیلی تیس و فیرجیل.. و أمری القیس و فەرەزدەق و ئەبو نواس... و ڕودەکی و ڕابیعە و فەررخی و فیردەوسی... و ڕونیسار و ڕابلیە و شکسپیر هاتنە ناسین. بەڵام جارێکی دیکە و لە قۆناغێکی باڵاتردا – بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، بە تایبەتی لە وڵاتانی پێشکەوتوودا – کە خوێنەواری و کتێب خوێندنەوە و تەنانەت سینەما و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن پەرەی سەند و گەلێك لە خوێنەران بە ڕێژەی

جۆراوجۆر هەم لە خوڵقان و هەم لە نەقدی بەرهەمێن ئەدەبی و هونەریدا شارەزاییان پەیدا کرد، ناوەڕۆك و ڕەمز و ئەوزار و تەکنیکی ئەدەبی کەمدابێژێك حاڵەتی تایبەتی و ریزپەڕی خۆی لە دەست داو بەهەمان ڕێژەش خوێنەری ئەمڕۆش لە خوڵقاندن و نەقدی بەرهەمێن ئەدەبیدا – بە تایبەتی لە بەرهەمێن ئەدەبی سەردەمی خوێدا – بەشێکی گەورەتر بەدەس دێنێ و بەشدارییەکی پتر دەکات.

بە هەرحاڵ کە دەق بە وشە سپێردراو، وشە لەناو پێکهاتەی دەقدا بوو بە تانوپۆی زمان و خوێنەریش پەی بەرەمز و رازی برد، ئیدی دەستکراوەتر دەبێ لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ دەقەکەدا و پێویستی بە نووسەر نامێنێ، و نەمانی نووسەریش رەنگە نەمانی رەخنەگری بە دوادا بێ و ئیدی هەم دەسەڵاتی نووسەر و هەم دەسەڵاتی رەخنەگر هەرەس دەێنن و خوێنەری جددی لە دایك دەبێ و بە خۆی هەموو بۆشاییەکان – ئەگەر بۆشایی رووبدات – پڕ دەکاتەوە و بە خۆی نێوەڕۆك و مانا و بایەخی دەقەکە دیاری دەکات.

-٢-

دەڵێن هەر کەسێك – و لە ئەنجامدا هەر نووسەرێك – لە بنەڕەتدا زادەی سەردەم و شوێنی خۆیەتی، یانی زادەی کۆ فاکتەرێن کۆمەڵایەتی و رۆشنبیریی و پەروەردەیی و مێژوویی ئەو شوێن و سەردەمەیە کە تیایدا پەروەردە دەبێ و بەرهەمی خۆی تیادا دەخوڵقێنێ.. هەڵبەتە ئەم ڕێسایە ناتوانێ بە وردی مانا و چەمکی بەرهەمی نووسەرێك یان مەبەست و نیازی نووسەرێك دیاری بکات. ئەمە جگە لەوەی، وێڕای ئەوەی کە ئەو فاکتەرانە هەر یەکێکیان بە ڕێژەیەك دەوریان لە خوڵقانی بەرهەمێکدا هەیە، دابەزینی بەرهەمێك بۆ ئاستی نموونەیەکی دەروونناسی، یان تێورییەکی کۆمەڵایەتی، یان بەرنامەیەك یا شیکردنەوەیەکی سیاسی، ئیدی هیچ شتێك بۆ ئەدەبیات نایەڵێتەوە. بۆ نموونە ئەگەر تاوان و سزا – ی دۆستۆفسکی تەنیا رەنگدانەوەیەکی حاڵەتە وردە دەروونییەکان بێ و دادگا – ی کافکا وێنە گرتنێکی فۆتۆگرافی کۆمەڵێك مەسەلەی روونی کۆمەڵایەتی بێ ئەدی رۆڵ و فایدەی ئەدەبیات چییە؟ هەر هەموو ئەم فاکتەرانە بەشێوە و ڕێژەی جۆراوجۆر دەور لە خوڵقانی بەرهەمێکدا دەبینن، لێ بەرهەمێکی ئەدەبی – ئەگەر بەراستی ئەدەبییەتی تێدا بێ – نایەتە خوارەوە بۆ ئاستی هیچ یەکێك لەوانە، واتە نابێ بەهیچ یەکێك لەوانە، ئەگەر ببێ ئەوا لەسەر حیسابی ئەدەبییەتەکەیە و لە ئەدەبییەت دەکەوێ. کەواتە دەرگا بە پلەی جۆراوجۆر و جیاواز بۆ رەخنە و رەخنەگر کراوەیە. و خوێنەریش بە ڕێژەی جیاواز بەشداری لەم رەخنەیەدا هەیە و لەوەشە لە هەندێ جارا بەتەواوەتی جێی رەخنەگر بگرێتەوەو (کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەرانبەر بە مەرگی رەخنەگر و پاشان مەرگی نووسەر دەوەستێتەوە).

بەهەر حاڵ پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە جاران گەلێك لە تایبەتمەندییە جۆراوجۆرە فەردی و کۆمەڵایەتییەکانی نووسەرێکیش لە ڕێگەی رەخنەگرەوە دەگەییە خەڵکی، واتە خەڵکی زیاتر لە ڕێگەی شەرح و شرۆڤەو توێژینەوەی رەخنەگر لە کەسایەتی و ژینگەی کۆمەڵایەتی نووسەر، نووسەریان دەناسی بەتایبەتی کە هیچ ژینامە و بیرەوەرییەك دەربارەی ئەو نووسەرانە لەبەردەستدا نەبووە، و ئەمە پتر لە ڕێگەی زەینی رەخنەگر و خوێنەرەوە مانای پەیدا کردووە و بەم شێوەیە ئەو ژینامەو بیرەوەریانەش قابیلی تەئویل و لێکدانەوەی جیاوازن" بەڵام خاڵی

گرینگ ئەمەیە کە لە زۆر بوارا، گەلێك لە (زانیارییەکانی) ڕەخنەگرو خوێنەر دەربارەی ژیان و ژینگەو تایبەتمەندی فەردی و کۆمەڵایەتی نووسەر لە خودی بەرهەمە ئەدەبیەکانی ئەوەوە هەڵێنجراوە. بەمجۆرە خودی نووسەریش تا ئەندازەیەکی زۆر لە ڕێگەی بەرهەمەکەیەوە دەناسرێت، ئەمە لە حاڵێکدایە کە بەرواڵەت وا پێدەچێت کە ئاشنایی دەگەڵ تابەتمەندی فەردی و کۆمەڵایەتی نووسەرو ژینگەی کۆمەڵایەتی نووسەردا، ماناو چەمکی بەرهەمەکەی دیاری کردووە. بەهەر حاڵ زۆر جار بەرهەمی نووسەر کاریگەری خۆی هەیە لە ناساندنی نووسەردا. واتە نووسەر بوونێکی ڕێژەیی لە بەرهەمیدا هەیە و بەرهەمەکەی دەبێ بە کلاورۆژنەیەك بۆ ناساندنی. سادقی هیدایەت یەکێکە لەو نووسەرانە.

***

مەسەلەی حوزوری ڕێژەی سادقی هیدایەت لە بەرهەمەکانیا دەکرێت بە دوو شێوە بخرێتە ڕوو: یەکەم هاندەرو نیازو نییەتی هیدایەت لەم بەرهەم یان لەو بەرهەمیدا یان لە کۆی بەرهەمەکانیا چی بووە، و ماناو چەمکی چیرۆکەکانی چییە. دووەم: شەخسی خۆی" خودی خۆی تا چ ڕادەیەك لە چیرۆکەکانیا حازرە، واتە تەبع و تەبیعەت و خوو خدەو ئەتوار و، بیرو بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی بە چ ڕێژەیەك لە چیرۆکەکانیدا ڕەنگی داوەتەوەو بەرجەستە بووە؟!

سەبارەت بە هاندەرو نیازو نییەت و مەبەستی نووسەرو ئەوجا ئەو ماناو چەمکەی خۆی لەناو بەرهەمەکەیدا پێی قاییلە و مەبەستیەتی، لە باشترین حاڵەتدا هەر نووسەر خۆی دەتوانێ دیاری بکات و ئەم شتەش یەجگار کەمەو ئەوجاش ئەو بەرهەمە قسەو لێکدانەوەو شەرحو شرۆڤەی دیکەش هەڵدەگرێت. سەبارەت بە پرسیاری دووەم ئەمە قابیلی لێکدانەوەو تۆژینەوەیە چونکە هەم ژیان و بیروپۆچوون و ژینگەی نووسەر بە جۆرێك لە جۆران لەبەرهەمیا ڕەنگدەداتەوەو خۆ سەبارەت بە یەکێکی وەکو هیدایەت، ئەوا زانیاری – جیا لەبەرهەمە ئەدەبییەکانی – لەبەر دەستدا هەیە.

لێرەدا زیاتر چیرۆکەکانی هیدایەتمان مەبەستە تا کارەکانی دیکەی. کارە چیرۆکڤانییەکانی دەکرا بەسەر چوار جۆردا دابەش بکرێن چیرۆکێن ڕیالستی و ڕەخنەوانی وەکو (طلب امرزش، علویه خانم)، نمایشنامە و چیرۆکە ناسیونالیستی و ڕۆمانتیکەکانی وەکو:(پروین دخترساسان، اخرین لبخند)، چیرۆکێن تەنزئامێزو تەنزنامەکانی وەکو ( حاجی اقا، قضیه زیربتە، و وغ وغ ساهاب)، چیرۆکە سایکولوژییەکانی وەکو (بوف کور، سەقطرەخون)، زندەبەگور، مردی کەنفش را کشت، عروسك پشت پردە).

هەڵبەتە ئەم خانەبەندییە بەو مانایە نییە کە هیچ جۆرە تێکەڵاوی و وێکچوونێك لە نێوان ئەو چیرۆکانەدا نیە، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوەیە کە هەر گرووپێك لەو چوار گرووپە ئەوەندەیان تایبەتمەندی و خاڵی هاوبەش لە نێوان دا هەیە کە لە گرووپەکانی دی جیا بکرێتەوە.

یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی چیرۆکە ڕیالیستی و ڕەخنەوانییەکانی هیدایەت ئەوەیە کە حوزوری نووسەر وەکو ژیانی تایبەتی و سایکولوژی و تەبع و تەبیعەت و بۆچوونە کۆمەڵایەتییەکانی، بەشێوەیەکی گشتی و لە چاو گرووپە چیرۆکەکانی دیکەیدا یەجگار کەم و ناچیزەیەو هەستی پێ ناکرێت. ئەم چیرۆکانە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیان و داب و نەریت و ئەتوارو ڕەوشت و هەڵس وکەوتی خەڵکی ئاسایی شارنشینی سەردەمی ئەوە (هیدایەت) بەڵام

ئەمانە لە قاڵبی بەرهەمی ئەدەبیدان نەك لە قاڵبی راپۆرتی رۆژنامەوانی و تێبینی و شەرح و شیکردنەوەی کۆمەڵناسی. هیدایەت بەزمان و تەکنیکی چیرۆکڤانی رەوشت و داب و نەریت و رەفتار و پەیوەندی و باوەڕو گیروگرفتی ئەو خەڵکە بەرجەستە دەکات و پیشانی دەدات. هەڵبەتە لەم چیرۆکانەدا هیچ لایەنگیرییەکی چینی چەوساوە بەدی ناکرێت و هیچ رێچکەو رێبازو بەرنامەیەکی سیاسی زەق هەست پێناکریٚ" خۆ ئەگەر بەرێکەوت و بە شێوەیەکی رەوتەنی و بەلەز جۆرە، داوەری و قەزاوەتێك بەدی بکریٚ، ئەوا داوەرییەکی سەلبی یە، چونکە گەلێك لە کاراکتەرانی ئەم چیرۆکانە خەڵکانی دووڕوو، درۆزن، بەد خوو بەد رەوشت و جار جار دزو پیاو کوژان، ئەمەش زادەو بەرەنجامی خەسڵەتێن ریالیستی و رەخنەوانی خودی چیرۆکەکانە. بەهەر حاڵ نووسەر داوەرییەکی ئەوتۆ سەبارەت بە گوفتارو کرداری ئەوانە ناکات و خۆ ئەگەر رەخنەگر یان خوێنەر داوەرییەکی لەو بابەتەی بەمیشکدا بیٚ، ئەوا داوەری ئەوە نەك هی نووسەر.

بەرهەمە ناسیونالیستی و رۆمانتیکەکانی هیدایەت، پێچەوانەی گرووپی پێشووە. واتا ئامادە بوون و حوزۆری سۆز و باوەڕێن نووسەر لەم بەرهەمانەدا – کە ژمارەشیان زۆر نییە – بە رادەیەکە کە هەندیٚ جار کار دەگاتە شیعاراتبازی و تەنانەت حنێو دان. ئەم بەرهەمانە رەنگدانەوەی ئەو ناسیونالیزمە رۆمانتیکیەیە کە رەگی لە سەدەی نۆزدە و بناوانە قوڵەکانی شۆڕشی مەشروتە دایە، بەڵام لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدا – و بە تایبەتی پاش کۆتایی جەنگ – تەقییەوە و کارێکی زۆری کردە سەر هەموو لایەنی کۆمەلایەتی و شارستانی ئێران. لایەنی رەسمی و دەوڵەتی ئەم ناسیونالیزمە بە خێرایی بوو بە ئایدولوژی دەسەڵاتی حوکمران. بەڵام لایەنە رۆشنبیری و نا رەسمییەکانی لە نێوان رۆشنبیران و نووسەران و شاعیران و خوێنەواراندا – تەنانەت لەناو ئەوانەشدا کە وەکو هیدایەت لە گەڵ دەسەڵاتی حوکمران تەبا نەبوون – رەواجی پەیداکرد و پەرەی سەند.

بە هەرحاڵ بیر و بۆچوونی ناسیونالیستی و رۆمانتیکی نووسەر بەشێوەیەکی زەق لە نمایشنامەێن پروین دختر ساسان و مازیار، و هەروەها لە کورتە چیرۆکێن سایە مغول، آخرین لبخند دا، دەردەکەویٚ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا دەکرێت بگوتریٚ چونکە ناسیونالیزمی رۆمانتیکی یەکێك بووە لە دیاردە بڵاوو باوە کارێگەرە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو زەمانە، بۆیە نووسەر (هیدایەت) لە بەرهەمەکانیا کاری لەسەر کردووە، واتە مەرج نییە ئەو هەستە ناسیونالیزمییە لەلای نووسەر هەبوویٚ، یان لەو هەستەدا شەرێك بوویٚ. بەڵام کاتیٚ کە تەمەشای هەندیٚ بەرهەمی ناچیرۆکی وەکو سەفەرنامەی أصفهان نصف جیهان و پێشەکی ترانەهای خیام دەکەین و بە هەمان شێوە و بگرە تۆختریش ئەو هەستە بەرجەستەکراوە، ئیدی هیچ گومان لەوە دانامێنیٚ کە راوبۆچوونی خودی هیدایەت لە نمایشنامە و چیرۆکە ناسیولیستییە رۆمانتیکییەکانیدا حازرە.

لە گرووپی سێیەمی بەرهەمەکانی هیدایەت – شدا، واتە لە چیرۆکە تەنز ئامێز و تەنزنامەکانیدا، ئەم حوزوری بیروبۆچوون و ئەندێشە و باوەڕە شەخسییانەی نووسەر کەمدابێژێك زەق و دیارە. بەڵام ئەگەر ئەو بیروبۆچوونە شەخسییانە لە بەرهەمە ناسیونالیست و رۆمانتیکییەکانی کەمتر نەبیٚ، ئەوا لە رووی ناسکی و ئەدەبییەتەوە گەلیٚ لەو بەرهەمانە بالاتر و

لە پێشترە.ئەم بەرهەمانە دوو لایەنی گرتۆتە خۆ، یەکێکیان رەخنەی ئەدەبییە و ئەوی تریان رەخنەی سیاسی.

تەنز و رەخنەی سیاسی هیدایەت – ش رەنگدانەوەیەکی بۆچوون و سۆزەکانی خودی هیدایەت خۆیەتی چونکە لە چەند بەرهەمێکی جیاوازی نووسەردا تووشی هەمان باوەڕ و هەست و سۆز دەبینەوە و لەوێشدا گاڵتە بە ئەنجومەنی دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی ئەدەبی دەکات. لە زۆربەی تەنزەکانی هیدایەتدا خوێنەر و رەخنەگر هەست بە ئامادەبوون و حوزوری خودی نووسەر دەکات و..

شۆرەت و ناوبانگی هیدایەت زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ گرووپی چوارەمی چیرۆکەکانی کە زیاتر سەر و سەختیان لەگەڵ حاڵەت و باری دەروونیدا هەیە. لەوانە: بوف کور سەقطرە خون، زندە بەگور، مردی کە نفش راکشت، عروسك پشت پردە، هوسباز، فردا و گەلێکی دیکە، لە باری تەکنیکەوە چەند چیرۆکیکی کەم لەمانە، شەقڵ و تایبەتمەندی مودیرنیستی وەرگرتووە و زۆر بەشیان لە ریالیزمی تەقلیدییەوە نزیکن.. بە هەرحاڵ بابەتی سەرەکی ئەم چیرۆکانە بە زەمان و شوێنی تایبەتییەوە بەندنین، بۆیە ناکرێت سیفەتی شەرقی یان غەربییان پێ بدرێت. هەڵبەتە شۆرەت و نێوبانگی هیدایەت پتر بەم چیرۆکانەوە – یەتی نەك تەنیا لەبەر ئەوەی کە (بوف کور) شاکاری ئەوەو چەند چیرۆکێکی سایکولوژی لە باشترین بەرهەمێن ئەون، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە خودی هیدایەت بەم چیرۆکانە و کاراکتەرێن ئەم چیرۆکانە و بابەتێن ئەم چیرۆکانەوە پێناسە دەکرێت و دەناسرێت، ئەم حاڵەتە گەیبوەتە رادەیەك کە هیدایەت لە ژینگە و کات و شوێنی خۆی هاتۆتە دابڕین و خەڵکانێکی زۆر لەناو ئەو چیرۆکانەدا بۆی دەگەڕێن و گەلێك لەو ئەفسانانەی لەمەڕ ژیان و گوتار و کرداری دروست کراون، لەو دەقانەوە" لە دەقی ئەو چیرۆکانەوە هەڵێنجراون. گوتمان ٢–٣ چیرۆکی دەرونی کەم دابێژێك مودرنیستین و ئەوانەی دیکە ریالیستین. بەڵام لە زۆر لایەنەوە هەم کەش و هەوا و فەزای چیرۆکەکان لێکدەچن و هەم رەگەزێن بنەڕەتی چیرۆکەکان و هەم ئەو مەسەلە و بابەتانەی کە گوتیاران (راوی) و کاراکتەرەکان روو بەرووی دەبنەوە و مامەڵەی لە تەکدا دەکەن.

فەزا و کەش و هەوا لەم چیرۆکانەدا بەرێژەی جۆراوجۆر سەنگینە" ژینگە ئاڵۆز و راز ئامێزە، و بابەت و مەسەلەکان بەتەم و ناروونە – و زۆر جار لە حەلکردن و چارەسەرنایەن. خۆلاسە لە کۆتایی هەر چیرۆکێکدا، بنیادەمێك، سەگێك، پشیلەیەك یان دەمرێت یان خۆکوژی دەکات، یان دەکوژێ، یان ون دەبێت و بێ سەر و شوێن دەبێ، یان هەڵدێ و سەری خۆی هەڵدەگرێت، یان بەلای کەمەوە تێك دەشکێت. بابەت و مەسەلەکانیش؟ مەسەلەی بوون – و نەبوونە، دنیا، جەبر و ئختیار، مەودای کێماسی و کەماڵ، بردنەوە و دۆڕان، سەرکەوتن و بەسەردا کەوتن. مەردایەتی و نامەردی پەیوەندی و دابڕانی پیاو لە ژن. بە هەرحاڵ ناکرێ خولیا و کەڵکەڵە و مەبەستەکانی نووسەر بەووردی و بە تەواوەتی لە هیچ بەرهەمێکی ئەدەبیدا دیاری بکرێت، واتە ناکرێ ئەو مانا و چەمکە رۆشن بکرێتەوە کە دەقاودەق نووسەر مەبەستی بووە. جا ئەمە بە تایبەتی دەربارەی ئەم جۆرە بەرهەمانە دروستە، کە بە حوکم و زەبری شێواز و تەکنیك و کەرەستەی ئەدەبی بەتەم و مژوو ئاڵۆز و پڕ پێچ و پەنایە، بەڵام کەشفکردنی حوزوری رێژەیی نووسەر (یانی راو بەهاو مەسەلە فەلسەفی و سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکانی نووسەر) لەم جۆرە

بەرهەمانەدا لە گوینە، هەم لە ڕێگەی بەراوردکردنی ئەم بەرهەمانە لەگەڵ یەکدیدا، و هەم لە ڕێگەی بەراوردکردنی ئەم بەرهەمانە لەگەڵ بەرهەمە ناخەیاڵییەکانی نووسەردا.

بۆ نمونە گەر تۆزێ بەوردی سەرنج بدەین دەبینین کە زۆر ڕەگەزی بنەڕەتی (بوف کور)، کەم و زۆر لە چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی دیکەی هیدایەتدا، چ لەوانەی پێش (بوف کور) نووسراون و چ لەوانەی پاش (بوف کور) نووسراون بەدی دەکرێن. بە هەرحاڵ نووسەری هەموو ئەم چیرۆکانە، هیدایەتە، بۆیە لێکچوونی نزیکی بیروبۆچوون و بەهاو داوەرییەکانی ناو ئەم چیرۆکانە بمانەوێ و نەمانەوێ جۆرە ڕەنگدانەوەیەکی حاڵات و بیرەکانی خودی هیدایەتە.

(زندە بەگور):

یەکێکە لە چیرۆکەکانی سەرەتای هیدایەت. لە ٢٦ ساڵیدا لە پاریس نووسیویەتی. ئەمە سەرگوزەشتە و حیکایەتی خوێنکارێکی ئێرانییە کە لەبەر هەندێ هۆی نادیار لە ژیان تێر بووەو چەند جارێك هەوڵی خۆکوژی دەدات تا لە کۆتاییدا خۆی دەکوژێت.. ئەگەر تەماشای هەندێ نامەی هیدایەت بۆ مەحمودی برای و بۆ دکتۆر تەقی ڕەزەوی بکەین هیچ گومانێك لەوەدا نامێنێ کە هەوڵە خۆکوژییەکانی هیدایەت لە ئەوروپادا، هەوێن و بنەمای چیرۆکی (زندە بەگوڕ) ـە، هەرچەند چیرۆکەکە ئەدەبییەتی خۆی هەیەو بریتی نییە لە شەرح و شرۆڤەیەکی سادەی حاڵەت و تەجرەبەکانی شەخسی هیدایەت.

(بوف کور)ش هەر (زندە بەگور)ـە و ڕەنگە بەزەبری شێوازەکەی قووڵییەکی هونەری زیاتری وەرگرتبێ بەڵام مەرگ و ئارەزووی مەرگ سەرانسەری چیرۆکەکەی تەنیوە. تا چاو هەتەر دەکات هەر مەرگە و تا گوێ دەبیستێ هەر دەنگی مەرگە و بەشەر لەو چیرۆکانەدا مەرگە مەرگ، مەرگ لە فریوو و تەفرەکانی ژیان نەجاتی دەدات.

بە هەرحاڵ لە ئەنجامی بەراوردێکی خێرای نێوەرۆکی هەر چوار گرووپە چیرۆکەکانی هیدایەتەوە ئەوەمان بۆ بە دیار دەکەوێ کە کارێگەری و ڕەنگدانەوەی بیر و بۆچوونەکانی و بەهاکانی لە چیرۆکە ناسیونالیستی ڕۆمانتیکی و تەنز و تەنزنامە – کانیدا، هەروەها سۆز و ئاکار و ئەزموونەکانی و کەسایەتی خۆی لە چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانیدا بەڕێژەی جۆراوجۆر هەستی پێدەکرێت.

بە هەرحاڵ بەپێی تەقسیمبەندی ڕۆلان بارت بۆ بەرهەمێن ئەدەبی، بەرهەمی ئەدەبی دەکرێت بە دوو بەشەوە، بەشی خوانشی (بۆ خوێندنەوە) و بەشی نگارشی (بۆ نووسین) واتە لە بەشی یەکەمدا خوێنەر تەنیا بە شداریی خوێندنەوە دەکات، و لەبەشی دووەمدا خوێنەر بەشداری نووسین دەکات، بە هەرحاڵ ئەمە حوکمی بنجبڕش نییە. بەرهەمی خوانشی ڕێژەیەکی زۆر لە ڕاوبۆچوون و بەهاکانی نووسەر دەگرێتە خۆ، و خوێنەر ناتوانێ لە (نووسینەوەی) بەرهەمەکەدا ڕۆڵێکی تەواو بدینێ. جا لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاو بۆچوونانەدا بەرهەمە ناسیونالیستی و ڕۆمانتیکەکانی هیدایەت خوانشی ترین بەرهەمی هیدایەتن، چونکە حوکم و بەهاو داوەرییەکانی خودی نووسەر زۆر بەفراوانی و بەخەستی لەو بەرهەمانەیدا دەبینرێن، هەڵبەتە ئەمە نابێتە مایەی ئەوەی کە خوێنەر بەزەرورەت ئەو ڕاوبۆچوون و بەهاو کەڵکەڵانە پەسند بکات... بەشێوەیەکی گشتی تا ئەدەبییەتی بەرهەمێك لاوازتر بێ خوێنراوتر دەبێ (ئەگەر چی لەوەشە

بەرهەمێكی خوانشی لە كوللییەتدا لە بەرهەمێكی نگاریشی باشتر بێ) هەڵبەتە ئەو حوكمانەی سەریێ سەبارەت بە تەنز و چیرۆكە تەنز ئامێزەكانی هیدایەت زۆر كەمتر تەتبیق دەبێت.

یەكێك لە گیروگرفتەكانی هەڵسەنگاندنی چیرۆكەكانی هیدایەت ئەوەیە، كە لە كاتێكا پێویستە چیرۆكی ریالیستی و رەخنەیی خوانشی تر بێ و چیرۆكی سایكۆلۆژی نگارشی تر بێ، كە چی ئەم رێسایە سەبارەت بە چیرۆكە ریالیستی و چیرۆكە سایكۆلۆژییەكانی هیدایەت بەزەرورەت دروست نییە. ئێمە لە بەراوردی چیرۆكەكانی هیدایەتدا ئەوەمان بۆ بەدیاركەوت كە شەخسی هیدایەت وەكو راوبۆچوون و ئایدۆلۆژیا و داوەری ئەوەندە بەرجەستە و بەرچاو نییە، كەچی حوزوری لەناو چیرۆكە سایكۆلۆییەكانیدا تا ئەندازەیەكی زۆر دیارە و هەستی پێدەكرێ. لەگەڵ ئەمەشدا دەستی خوێنەر لە شەرح و تەعبیر و لێكدانەوە و شرۆڤە – و بە مانایەكی دی لە (نووسین)ی (بوف كور)، سەقطرەخون، مردی كە نفش راكشت، و زندە بەگور كراوە ترە تا لە علویە خانم، طلب آمرزش و حاجی مراد و مردە خورها.

دەكرێت ئەم ناكۆكییە رواڵەتییە بەپشتیوانی ئەم خاڵانە بێتە روونكردنەوە" حوزوری هیدایەت لە چیرۆكە سایكۆلۆژییەكانیدا لە بنەڕەتدا حوزورێكی عاتیفی و دەروونناسییە نەك حوزوری ئەقڵی و كۆمەڵایەتی لەم بەرهەمانەدا ئێمە لە تەماسی نووسەر لەگەڵ زاراوەێن گەورەی زەمینی و ئاسمانی – بوون، نەبوون، ئەشق، ئەخلاق، چارەنووس و ئەو شتانە – نزیك دەبینەوە.

ئەمەش نیشانەی ئەوەیە كە هەر یەكێك لە ئێمە ئازادە كە بە مەزەندە و بۆ چوونی خۆی مانا و چەمكی ئەو بەرهەمانە، و نووسەری ئەو بەرهەمانە بدۆزێتەوە و كەشفی بكات و شەرح و شرۆڤەی بكات.. بە هەر حاڵ دەكرێت بگەینە ئەو ئەنجام و رێسایەی كە حوزوری عاتیفی و دەروونناسی نووسەر لە نووسینەكانیدا ناكاتە سڕینەوەی نگارشی بوونی ئەو بەرهەمە، لەبەر ئەوەی:

١– زاراوەێن ئەقڵی و كۆمەڵایەتی بناغەی كارەكە پێك ناهێنێ و

٢– ئەو شێواز و تەكنیك و ئەوزارە ئەدەبییانەی كە لە بەرهەمەكەدا بەكار براون لە جێی خۆیاندا و بەدەوری خۆیان كاریگەریان بەسەر خوانشی بوون یان نگارشی بوونی ئەو بەرهەمەوە هەیە كە تیایدا بەكار هاتوون. واتە تەكنیك و شێواز و كەرەستە ئەدەبییەكان خوانشی بوون یا نگارشی بوونی دەقەكە دیاری دەكەن.

–٣–

وەختێ هیدایەت مرد ئیدی گەلێك ئەفسانە و حیكایەتی بە پەڕو باڵ دەربارەی خۆی و ژیانی هاتە هەڵبەستن و هۆندنەوە، لە ئەنجامیشدا ئەوە روون نەبووەوە كە ئەو ژیانە چ بوو كە بەم مەرگە كۆتایی هات.

بێگومان ئەویش مرۆڤێك بوو لە چوارچێوە گشتییەكەدا وەكو هەر مرۆڤێكی دی حیسابات و گیروگرفت و گرفتاری خۆ هەبوو، یانی لە مەسەلە و گرفتارییە گشتییەكاندا وەكو هەر مرۆڤێكی سەردەمی خۆی وابوو، لێ لە وردەكاری و تایبەتمەندییەكاندا لە زۆربەی خەڵكی جیاواز بوو. جا ئەم جیاوازییە خۆی لە خۆیدا خاڵی وەرچەرخان و دابڕان و سەرچاوەی سەر یەشەكانە، چونكە كە ئەویان نەناسی لێی ترسان، كە لێی ترسان، دەریانكرد، و حاشایان لێكرد و نكوڵییان لێكرد

و ترساندیان، ئەم هەڵوێستە ستەمامێزە بووە هۆی ئەوەی کە هیدایەت زیاتر لێیان بترسێت و دەست لەسەر ئەو شتانە دابگرێ کە ئەوانی دەترسان. بە هەرحاڵ وەختێ مرد ئەو ترسەیان لە دڵدا رەوییەوە و ئەوجا هاتن بەرهەمەکانیان کرد بە چەکێك بۆ ترساندنی خەڵکی دی..

بە هەرحاڵ ئەمە شتێکی تازە نەبوو، کۆمەڵ لە سەرەتاوە ئەو بابەتە خەڵکە دەکوژن و پاشان دەیانکەن بە شەهید. ئەوەتا سەرپەرشتیاری گشتی (المفتش العام) لە رۆمانی برایانی کارامازۆفدا لە زیندندا بە تاپۆیەکەی مەسیحی گوت کە ئەو جیهانێکی دابوو بەیەکدا، و ئەوان – بە ناوی ئەوەوە – نەزمێکیان بۆ جیهان گەڕاندبووەوە ( ئێستا بۆ چی گەڕاوێتەوە کە ئێمە بخەیە زەحمەتەوە؟)

بێگومان لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کە بگوترێ هیدایەت بێ غەل و خەوش و عەیب بووەو هەرچی دەگوت و دەکرد هەر لەسەر هەق بوو، و هەر کەسێ لە بارەیەوە بڵێ لەل لە خاچ بدرێ.

مەسەلەکەمان ئەمەیە کە نووسەر تا چ ئەندازەیەك بەرهەکەمەی (خۆی دەینووسێت). واتە رۆڵی رێژەیی نووسەر، رەخنەگر و خوێنەر لە دیاریکردنی مانا و چەمك و بەها و گرینگی بەرهەمدا چییە. لە کۆندا رۆڵی خودی نووسەر، ژیانی، چینی، ژینگەی کۆمەڵایەتی، ئاکار و مەبەستەکانیان دەخستە ریزی پێشەوەی تۆژینەوە و هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە. لە سەدەی بیستەمیشدا رێبازە جیاوازەکانی رەخنە" رەخنەی کلاسیك و ریالیزمی سوسیالیستی و رەخنەی شیکاری دەروونی – هەریەکەیان، وێڕای جیاوازی و ناکۆکیان دەگەڵ یەکدیدا – لە هەڵسەنگاندنی بەرهەمێن ئەدەبیدا تاکیدیان لەسەر تایبەتمەندییە فەردی و کۆمەڵایەتییەکانی نووسەر دەکرد. بەڵام ئەم رەوت و رێبازە لە هەندێ تیۆریانی دیدا – لە فۆرمالیستانی روسی و ئەنجومەنی پراگ –وە بیگرە تا رەخنەی نوێی ئینگلیزی – ئەمریکایی – بەرە بەرە وەلانرا، تا ئەو شوێنەی کە بونیادگەرایان و بونیادشکێنان – بەگوتەی رولان بارت – (مەرگی نووسەریان) راگەیاند.

بە هەرحاڵ لە کۆنیشدا، لە هەندێ قۆناغاندا حەساوی زۆر بۆ گوێگر و خوێنەر کراوە و دەوریان لە پێك هێنان و تێگەیاندن و لە دوا ئەنجامدا لە (نووسین)ی بەرهەمێکی ئەدەبیدا هەبووە. هەر بۆیە حیکایەت و ئەفسانە کۆنەکان – بەر لەوەی شێوەی ئەدەبیاتی نووسراو وەربگرن – دانەر و نووسەری دیاریان نەبووە. (مەرگی نووسەر). کەچی لە قۆناغەکانی کلاسیکدا – بۆ نموونە لە یونان و رومی کۆن، لە ئێرانی پاش ئێسلام، و لە ئەوروپای پاش رینیسانس – رۆڵی – نووسەر و گوتیار زاڵ بووە. لە دنیای ئەمڕۆدا – دیسانەوە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمەوە – دیسانەوە خوێنەر رۆڵێکی چالاکتر و دیارتری لە خوڵقاندنی بەرهەمی ئەدەبیدا وەرگرتوەتەوە. جا لەم بوارەدا دەبێ رۆڵی رەخنەگریش رەچاوبکرێ، چونکە زۆرێ لەو رۆڵەی دراوەتە پاڵ نووسەر لە حەقیقەتدا رۆڵی رەخنەگرە. ئێمە بە زۆری شەخسی نووسەر و ئەو دەورەی دەیبینێ لە رێگەی رەخنەگرەوە دەیناسین. کەواتە ئەگەر قەرار بێ مەرگێك – هەڵبەت بە مانا استعارییەکەی – لە ئارادا بێ ئەوا (مەرگی رەخنەگر) لە پێش (مەرگی نووسەردایە). کاتێ کە رەخنەگر (مرد) نووسەریش خۆ بەخۆ (دەمرێ)

بەرهەمێن هیدایـەت - جگـە لـە لێکۆڵێنـەوەکانی لەمـەڕ دەقێن پەهلـەوی و کـەلتووری عامیانـەی فارسـی - دەتـوانرێ بکـرێ بـە چـوار گوروپـەوە. چیرۆکێن ناسیونالیسـتی و حیکایـەت و دەقێن تـەنزئامێز، بەرهـەمێن ریالیسـتی و چـیرۆکە سـایکۆلۆژییەکان. هەڵبەتـە ئـەم خانەبەندییـەش، خانەبەندییەکی یەکجارەکی و بنجبڕ نییە، واتە چیرۆکەکان بە تەواوەتی لێکدی دانەبڕاون. بەڵکو لـە راسـتیا هەسـت و کەڵکەڵـە ناسیونالیسـتیەکانی هیدایـەت لـە گـەلێك لـە بەرهەمـە جـۆراو جۆراەکانیدا کەمدابێژێك دیار و بەرجەستەیە.

چیرۆکە ناسیونالیستیەکانی هیدایەت رەنگدانەوەی ئەو هەستە توند و رۆمانتیکیانەیە کە لـە سـەردەمی جـەنگی جیهـانی یەکەمدا لـە نێـو رۆشـنبیران، هونەرمەنـدان و خوێنـەوارانی مـودێرنی ئێرانیـدا رەواجـی پەیـدا کـرد، و پاشـان لـە سـەردەمی پەهلەویـدا گـۆڕاو بـوو بـە نیمچـە ئایدولۆژییەکی دەوڵەتی.

یەکێك لە دیاردە گرینگەکانی ئەم هەستە توندە خۆ بەستنەوەی توند و خـەیاڵی بە ئێرانـی بـەر لـە ئیسـلامەوە بـوو کـە هەمیشـە لەگـەڵ ئێرانـی هاوچـەرخدا - واتـە ئـەو ئێرانـەی کـە ١٣ سـەدە موسوڵمان بووە - بەراورد دەکرا، هەڵبەتە ئەنجامی ئەم بەراوردە زۆربەی کات ئەوە بوو کە دەبێ لە کەلتوری ئیسلامیدا بۆ رەگ و ریشەی هەژاری و داماوی و لاوازی و پاشکەوتوویی ئێران - ی سەردەمی قاجارییەکان بگەڕێی. ئیدی ئەمەش جۆرێك لە رقی سەبارەت بە عەرەب لێدەکەوتـەوە بـەو حەساوەی نەتـەوەی عـەرەب هـەم داهێنـەری ئیسـلام بـووە و هـەم فاکتـەری تەسـلیم بـوونی کۆمەڵگەی کۆنی ئێران بووە.

هەڵبەتـە لـەناو بەرهەمـەکانی هیدایەتدا، نمایشـنامەی (پروین دختر ساسان و مازیار)، کورتـە چیرۆکی (آخرین لبخند) هـەروەها بەشێك لـە پێشـەکی (ترانـەهای خیـام و سـەفەرنامەی (أصـفهان نصف جیهان) نمایندەی ئەم جۆرە هەستە توندە ناسیونالیستی و رۆمانتیکییەن.

راسـتە هیدایـەت هـەرگیز بـە تـەواوەتی دەسـتبەرداری هەسـتی ناسیونالیسـتی نـابێ، بـەڵام لـە ناوەڕاستی سەردەمی رەزا شاوە - کە ئەم جۆرە هەستانە بوونـە دەسـتمایەی گـەورەی بانگەشـەو پرو پاگەندەی دەوڵەتی - ئیدی هیدایەت نەك هـەر چیرۆکی ناسیونالیسـتی نانووسێت بەڵکو لـە کورتە چیرۆکی (میهن پرست)دا ئـەم جـۆرە بانگەشـە دەوڵەتییـە دەداتـە بـەر تـەوس و تـوانج و بـە تـەواوەتی خـۆی لـە ناسـیونالیزمی دەوڵـەتی جـودا دەکاتـەوە. لـە (تـوپ مرواریـد)دا هیدایـەت پاشماوەی هەستێن ناسیونالیستی خۆیشی وەلاوە دەنێ وگاڵتەی پێدەکات.

(توپ مروارید) لە گرووپی دووەمی بەرهەمەکانی هیدایەتە. واتە نموونەیەکە لە نووسینە تـەنز ئامێز و پڕ تەوسەکانی. تەوس و توانج و تەنز چ لە قسەو گفتوگۆدا و چ لە نووسیندا یەکێك بـوو لـە تایبەتمەندییـەکانی هیدایـەت. لـە راسـتیدا لـە زۆر بەرهـەمی تـەنزئامێزی خۆیـدا، لـە سـنووری ئاسایی و باوی تەنز هێوەتر دەڕوات و کار دەگاتە گاڵتەپێکردن و داشۆرینی راستەوخۆ.

بێگومـان چ بەرهـەمێن ناسیونالیسـتی و چ تـەنزەکانی هیدایـەت، لـە رووی دەروونناسیشـەوە قابیلی باس و تۆژینەوە و لێکۆڵینـەوەن. لـە بەرهەمـە ناسیونالیستییەکانی هیدایـەت دوو لایـەنی دەروونناسی بە دی دەکرێ: یەکیان لایەنی دەروونناسی کۆمەڵایەتییەو ئەو دیکـەیان ئـەو توندی و زبـری و توڕەییەیـە کـە لـە بـەیان و دەربـڕینی ئـەم هەسـتە ناسیونالیسـتیانەدا پەنهانـە. دەکـرێ

بگوترێ كە لایەنی دووەمی باری دەروونناسییەكە لەناو بەرهەمە ناسیونالیستییەكانی هیدایەتدا زاڵترە. تەنز بۆ هیدایەت وەسیلەیەكە هەم بۆ پۆشینی رق و تووڕەیی و هەم بۆ دەربڕینی ئەو رق و تووڕەییە بە شێوەی پێكەنیناوی و هێرش ئامێز. تەنز خۆی لە خۆیدا چەكێكی بەڕەڤانییە كە هیدایەت هەم برینەكانی پێ دەپێچێت و دادەپۆشێت و هەم تۆڵەی خۆ پێ لەو كەس و شتانە دەكاتەوە كە بە سەرچاوەی ئەو پەریشانییەیان دەزانێ كە گیرۆدەی بووە.

دیارە گرووپی سێیەمی بەرهەمێن هیدایەت، واتە چیرۆكە ریالیستییەكانی كەمتر لە دوو گرووپی هەوەڵ قابیلی شیكاری دەرونییە، دیارە هیچ بەرهەمێكی هونەری – بە تایبەتی چیرۆك – لە حاڵەتی دەرونی بەدەر نابێ و بەمەش بە جۆرێك لە جۆرەكان دەكەوێتە بازنەی تۆژینەوە و شیكاری دەرونییەوە.

واتە هەرچەندە بەرهەمە ریالیستییەكانی هیدایەت هەوێنی دەروونناسی فەردی و كۆمەڵایەتی بەهێزیان تێدایە، بەڵام ئەو ناوەڕۆك و هەوێنە زیاتر بەندە بە خودی چیرۆكەكەوە تا بە نووسەری چیرۆكەكەوە (هیدایەت) بۆ نموونە چیرۆكێن علویە خانم، طلب آمرزش، محلل، و ...) بەرهەمە ریالیستییەكانی دیكەی هیدایەت پڕن لە هەوێنی دەروونناسی پەیوەست بە خودی چیرۆكەكانەوە، بەڵام باری دەرونی نووسەر و تەنانەت بیر و باوەڕە كۆمەڵایەتییەكانی هیدایەت – ش لە میانەی ئەم بەرهەمانەوە بە دەست نایەت.. لەم جۆرە چیرۆكانەدا كە بابەتەكانیان پتر رەخنەی كەلتووری – كۆمەڵایەتییە، هیدایەت – بە پێچەوانەی زۆر لە نووسەرانی سەردەمی خۆیەوە زیاتر دەوری بینەرێكی ورد و وردبین دەبینێ كە خۆی تێكەڵی چیرۆكەكە ناكات. نە وەكو محمد مسعود لە میانەی ئەم جۆرە چیرۆكەیەوە دەست بە هاوار دەكات و نە وەكو حجازی دەكەوێتە پەند و ئامۆژگاری حەكیمانە، و نە وەكو جهانگیر جلیلی لە داخ و خەفەتی نەخوێنەواری و جەهل و فەسادی كۆمەڵایەتی دەكەوێتە گریان.

گرووپی چوارەمی چیرۆكەكانی هیدایەت كە ناومان لێنان چیرۆكێن سایكۆلۆژی، ئەم چیرۆكانە چ ریالیستی بن چ سوریالیستی بن و چ هی دیكەبن، دیارترین و گرنگترین خەسڵەتیان ئەمەیە كە مەسەلەی فەلسەڤی، ئەنتۆلۆژی، سایكۆلۆژی و – تا ئەندازەیەكی كەمتر – كۆمەڵناسی بابەتی سەرەكیان پێكدێنێ. دەتوانرێ ئەم تایبەتمەندییەی چیرۆكە سایكۆلۆژییەكانی هیدایەت لە دوو ئاستدا بدینرێ: یەكێكیان ئەوەیە كە بایەخ و گرینگی چیرۆكڤانی ئەم بەرهەمانە لە چیرۆكی گرۆپەكانی پێشوو كەمترە. دووەمیان ئەوەیە كە كات و شوێنی چیرۆكەكە هەرچی یەك بێ ئەوا بابەتی چیرۆكەكە، یان لایەنی سەرەكی چیرۆكەكە یۆنیڤێرسەڵە (عالەمییە عامە) گشتییە، لەم روەوە پەیوەست بەكات و شوێنێكی تایبەت نییە. بۆ نموونە چیرۆكی (زندە بەگور) كە لە چیرۆكەكانی هەوەڵی هیدایەتە، لە فەرەنسا نووسراوە، لە سێ لایەنەوە رواڵەتی ریالیستی هەیە. یەكێكیان لە لایەنی هونەرییەوە، دووەمیان لەم لایەنەوە كە چیرۆكەكە شوێن و كاتێكی هەیە كە خوێندكارێكی ئێرانی لە چواچێوەیدا خۆ دەكوژێ، سێیەم لەم لایەنەوە كە ئەم چیرۆكە لەسەر بناغەی هەوڵی خۆكوژییەیەكی هیدایەت كە لەو كاتانەدا روویداوە رۆنراوە و نووسراوە.

بە هەرحاڵ بابەتی( زندە بەگور) هەمان بابەتە كە زۆر جاران لە بەرهەمێن سایكۆلۆژی هیدایەتدا، كە شوێن و كاتی تایبەتیان نییە، دوو بارە بووەتەوە هەر یەكێك لەم چیرۆكانە ئەگەر چی تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەڵام لە هەر هەموویاندا باس هەر باسی مەرگ و ژیان، كێماسی

**و کەماڵ، سەرکەوتن و شکست، بەهاکانی کۆمەڵ، بایەخی مرۆڤانی دیکە، جەبر و ئیختیار، هەق و ناهەقە.**

**ئەوەی لەو چیرۆکە سایکۆلۆژیانەی کە بەر لە (بوف کور) نووسراون مایەی سەرنج بێ ئەوەیە کە هەر یەکێك لەو چیرۆکانە کەم دابێژێك جۆرە زەمینەیەکی بۆ لە دایکبوونی بوف کور خۆش کردووە، لەتۆ وایە هەوەڵجار بوف کور نووسراوە و ئەوجا شوێنەوار و ماکی لەو چیرۆکانەدا بەجێ هێشتووە. بۆیە دەکرێ ئەم چیرۆکە سایکۆلۆژیانە بە جۆرە بەرنامەیەکی درێژخایەن بزانرێ کە بەرە بەرە دەچێتە پێشێ و لە (بوف کور)دا دەگاتە لوتکەی خۆی.**

**هەڵبەتە مەبەست ئەوە نییە کە وەختێ نووسەر لە ساڵی ١٩٢٩دا (زندە بەگور)ی نووسی بەرنامەیەکی لەم جۆرەی لە زەین و مێشکدا هەبووە و ئەنجام لە ساڵی ١٩٣٦دا بە نووسینی (بوف کور) تەواوی کردووە. بەڵکو مەبەست ئەمەیە کە (بوف کور) بە هیچ جۆرێ زادەی رۆژ و دوو رۆژ نییە، بەڵکو لە رووی بونیاد، جەوو دەروونناسی و فەلسەفە و ئەنتۆلۆژی و زۆر وردەکاریی دیکەوە قەرزار باری ئەو هەوێن و تیمانەیە کە لە چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی پێشووی هیدایەت و لە یەك دوو شوێنیشدا لە پێشەکی ترانەهای خیامدا هەن. واتە ئەگەر بمانەوێ بۆ سەرچاوەکانی (بوف کور) بگەڕێین، دەبێ زیاتر لە چیرۆکەکانی پێشووتری هیدایەتدا بۆی بگەڕێین تا لە بەرهەمەکانی کافکا، ئەدگار ئالن پو، جیرار دونیرڤال و ئەوانی دی.**

**(عروسك پشت پردە)، (سەقطرە خون) و (مردی کەنفش راکشت) باشترین نموونەی ئەو چیرۆکانەن کە لە رووی بونیاد، فیکر و ئەندێشە، لە رووی هەست و سۆزەوە، و لە کەش و هەواو هاماجدا وەکو (بوف کور) وان.**

**زۆربەی چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی هیدایەت، رێك وەکو تراژیدییەکانی شەکسپیر، کە دەگەنە کۆتایی، یەك دو جەنازە لەسەر شانۆکە دەکەون.**

**بەڵام بە هەرحاڵ دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بەر لەوەی هەندێ لایەنی سایکۆلۆژی یا کۆمەڵناسی یا هەر زاراوەیەکی دیکەی لەو بابەتە عەکس بکاتەوە و بنوێنێ، بەرهەمێکی ئەدەبییە. داگرتنی بەرهەمێکی ئەدەبی بۆ ئاستی زاراوە و تێوری سایکۆلۆژی کارێکی تا رادەیەك ئاسانەو و پێویستە بە هۆشیارییەوە خۆتی لێ بپارێزی.**

**گوتمان بوف کور لوتکەی چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی هیدایەتە و ماکی لە چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی پێشووتری هیدایەتدا دیارە و هەیە بە تایبەتی لە (عروسك پشت پردە)، (سەقطرە خون)، (مردی کەنفش راکشت).. (بوف کور) بە مانا تەقلیدییەکەی چیرۆك، چیرۆکێکی ریالیستی نییە، بە هەرحاڵ حیکایەتی ئەم چیرۆکە لە دوو زەمانی جیاوازدا روو دەدات. حیکایەتی (زن اثیری) پەیوەستە بە سەردەمی هاوچەرخەوە، و حیکایەتی (زن لکاتە) لە سەدەکانی ناڤیندا، و لە سەردەمی زێڕینی شاری رەیدا روودەدا.**

* * * *

**بە هەرحاڵ ئەدەبییەت پێگەی راستەقینە و هونەری هەر بەرهەمێکی ئەدەبی دیاریی دەکات. واتە بەرهەمێکی ئەدەبی بەر لەوەی هەر شتێك – ی تر بێ، بەرهەمێکی ئەدەبییە، نەك بەرهەمێکی دەروونناسی یا بەیاننامەیەکی سیاسی، یان تێورییەکی کۆمەڵایەتی – ئەگەرچی لەوەشە لە ناوەڕۆکدا ماکێکی ئەوانەشی تێدا بێ. هەڵبەتە مشت و مڕە کۆنەکەی (هونەر بۆ**

**هونەر، یا هونەر بۆ کۆمەڵ) لە بنەڕەتدا غەڵەت خرا بووە روو. هونەر هەم بۆ هونەرە و هەم بۆ هونەریش نییە: بۆ هونەرە چونکە لە غەیری ئەم شێوەیەدا هونەر نییە. بۆ هونەر نییە، چونکە ناسینی هونەر پێویستی بەوەرگر و موخاتەب هەیە. واتا خوێنەر و بینەر و بیستەر هونەر دەکەن بە هونەر. هەر بە هەمان پێوانە هونەر هەم بۆ کۆمەڵە و هەم بۆ کۆمەڵیش نییە: بۆ کۆمەڵە چونکە نەك هەر موخاتەبی هەیە، بەڵکو کاریگەری تێوریان و زاراوە و دیاردەێن کۆمەڵایەتیشی بە سەرەوە هەیە (ئەگەر لە ڕێگەی زەین و زەینیاتی داهێنەرەکەشەوە بێ). بۆ کۆمەڵ نییە، چونکە تایبەتمەندییەکانی لە رۆژنامەوانی رووت، لە بانگەشەی سیاسی، لە مێژوونووسی، لە کۆمەڵناسی و ئەو شتانە جیاوازە، بێگومان هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بگری کەم دابێـژێك کاریگەری ئەو بابەتانەی پێوە هەیە، بەڵام ئەمە بەرهەمەکە ناکات بە بەرهەمێکی نا ئەدەبی.**

**بۆ نموونە (زستان)ی) أخوان** ثالث **دەکرێ لە روانگەی سیاسی و دەروونناسییەوە شی بکرێتەوە، بەڵام (زستان) هۆزانە" بەیاننامەیەکی سیاسی یان تێوری دەروونناسی نییە. (بوف کور)ی هیدایەت گەلێك جار و بەشێوەی جۆراوجۆر لە روانگەی سیاسی، دەروونناسی و کۆمەڵناسییەوە خراوەتە بەر رەخنەو شیکردنەوە، بەڵام (بوف کور) رۆمانە، هیچ یەکێك لەو بابەتانە نیە.**

**بابەتێکی گرینگ لە بواری ئەفراندندا هەیە کە پێویستە ئاماژەیەکی کورتی بۆ بکەین ئەویش رۆڵ و بایەخی ژیانی هونەرمەندە لە خوڵقاندنی بەرهەمەکەیدا. ئەم بابەتە بە تایبەتی لە رۆمان و چیرۆکدا مشت و مڕی زۆری لەسەر چێ بووە. سەردەمانێ گەلێك لە رەخنە ئەدەبییەکان لەسەر بناغەی ژیانی خودی نووسەر رۆدەنرا، یان بە پێچەوانەوە ژیاننامەنووسان بەرهەمی نووسەرێکیان دەکرد بە سەرچاوەی سەرەکی کاری خۆیان لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا قوتابخانەی (رەخنەی نوێی انگلیزی – ئەمریکایی) مەسەلەی ژیانی شاعیر و نووسەر، و تەنانەت (نیاز و مەبەستی) شاعیر و نووسەریان خستە بەرپرسیار بە پەیدابوون و دەرکەوتنی (بونیادگەرایی) بایەخ و رۆڵی خودی نووسەر لە لێکۆڵینەوەی بەرهەمێن ئەدەبیدا زیاتر هاتە خوارەوە و وەختێ نۆرە هاتە سەر (بونیادشکێنی) یەکێك لە پێشەنگای ئەم تێوەرییە ئەدەبییە (رولان بارت) (مەرگی نووسەر)ی راگەیاند. ئەگەر ئەم بۆچوونە دروست بێ کە (بەرهەم) نووسەر دەنووسێت، نەك نووسەر بەرهەم بنووسێت)و ئەگەر ئەم بۆچوونەی گەلێك لە (بونیادشکێنان) – کە مەرج نییە لەگەڵ بۆچوونەکەی پێشدا جیاواز بێ– قەبوڵ بکرێ کە رۆڵی سەرەکی و بناغەیی بە خوێنەرە نەك بە نووسەر، ئەوا ئاشکرایە کە زانست و ئەزموون و راو خولیا و زەینیات و تەنانەت نیاز و مەبەستی نووسەر ناتوانێ رۆڵی سەرەکی لە خوڵقاندنی بەرهەمدا هەبێ. بە هەرحاڵ ناکرێ زیاد لە پێویست دەست لەسەر ئەمە دابگیرێ و بە حوکمی رەها بزانرێ، چونکە لە کاری زۆر زۆر هونەریشدا کەم دابێژێك سێبەری نووسەر، گەر کەسێك بیەوێ بۆی بگەڕێ، دەدۆزرێتەوە. جا ئەم حاڵەتە (حوزوری نووسەر لە بەرهەمدا) لە هەندێ بەرهەمی هیدایەتدا (لە چیرۆکە سایکۆلۆژییەکان)یدا دەبینرێ چیرۆکە سایکۆلۆژییەکانی هیدایەت لەو جۆرە چیرۆکانەن کە لە رووی دۆز و ناوەڕۆکەوە – کەم دابێژێك – خاڵی فەلسەفی، ئەنتۆلۆژی، دەروونناسی و ئەو بوارانەی لە خۆ گرتووە، بەڵام هیچ یەکێك لەو خاڵانە بەو رادەیە زاڵ و زەق نین کە بتوانرێ بە بەیاننامەیەکی ئەو بوارانە حەساو بکرێ. بە گوتەیەکی دی هەموو ئەم بەرهەمانە بەرهەمی**

ئەدەبین بەڵام بۆتیقای بەرهەمەکان پتر لەسەر بناغەی ئەو بوارانە وەستاوە. لە ئەنجامدا ئەم چیرۆکانە – بۆ نموونە (بوف کور، زندە بەگور، سەقطرە خون، سگ و لکرد، مردی کەنفش را کشت و – بە هەموو ئەو جیاوازییانەوە کە لە نێوانیاندا هەیە، لە دوو تایبەتمەندی گشتیدا یەك دەگرنەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە نێوەڕۆکی چیرۆکەکانیان و هەروەها هەندێ جار کاراکتەرسازیان، سادە و سنوور دارە. دووەمیان ئەمەیە گەرچی زەمینەی کەلتووری، کۆمەڵایەتی و مێژوییان بێ چەند و چون ئێرانییە – ئەو مەسەلە و پرسانەی لەو چیرۆکانەدا خراونەتە روو کات و شوێن ناناسن، و لە دوا شیکردنەوەدا لە خانە و سنووری هیچ کەلتوور و شارستانیەت و کۆمەڵگەیەکی تایبەتیدا ناگیرسێنەوە.

* * * *

ژن بە کورت و کرمانجی، لە چیرۆکەکانی هیدایەت یا فریشتەیە یان قەحبەیە لایەنی نێگەتیف زۆر لە لایەنی پۆزەتیف زاڵتر دەردەکەوێ. پیاویش لەم جۆرە چیرۆکانەیدا بە زۆری لە رووی پەیوەندی سیکسییەوە لەگەڵ ژندا بێ تەجروبەو ناشییە. شەرم، گومان لە دروستکاری ژن، و ترس و نیگەرانی لە پەیوەندێین سۆزداری دەگەڵ ژندا لە تایبەتمەندییە دیار و بەرجەستەکانی پیاوە. واتە پیاو لە رووی پەیوەندێین سێکسی و سۆزدارییەوە دەگەڵ ژنی واقیعیدا، دەگەڵ ژندا وەکو لە بووندا هەیە، لەگەڵ ژنی مرۆڤدا، لەگەڵ ئەو بوونەوەرەدا کە دەکاتە کۆمەڵێك لایەنی لاواز و کۆمەڵێك لایەنی بەهێز، زۆر نامۆ و بێگانەیە و بەدووی ژنێکی ئایدیاڵدا وێڵ – ن کە بیان پەرستێ.. لەبەر ئەمە سەیر نییە کە هەم لە چیرۆکی (صورتکها) و هەم لە چیرۆکی (س. گ. ل. ل.)دا بە راشکاوی دەگوترێ کە پیاو (ئاشقی ئەشقە) دیارە ئەم (ئاشقی ئەشقە) لە رووی دەروونناسییەوە دەکاتە (ئاشق بوونی خۆ) واتە جۆرێکە لە (نارسیسم) کە خۆی لە خۆیدا زادەی بێ متمانەییەکی توندە بەخۆ و بە هەرحاڵ ژن لە بەرهەمەکانی هیدایەتدا – بەلای کەمەوە لە رووی سیکسی و سۆزدارییەوە – وەکو بوونەوەرێکی بیگانە و نەناسراو دەمێنێتەوە. ئایا لە ژیانی خودی هیدایەت –شدا ژن بوونەوەرێکی نەناسراوو بێگانە بووە؟

* * * *

یەکێك لە گرفتە خەتەرەکانی کۆمەڵگەکانی رۆژهەڵات ئەوەیە کە هێندە پێشنەکەوتووە کە بتوانێ بە هۆشیارییەوە بەرهەمی هونەری، بیر و بۆچوون و بەرنامە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت خودانی ئەو بەرهەم و بۆچوونانە بخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنەوە و هەر لایەنێك لە لایەنەکانی هەر روداوو دیاردەیەك بە پێوەر و پێوانەی تایبەتی خۆی هەڵسەنگێنێ و لە مەحەکی رەخنەی بدات. لە لای ئێمە یان سپیە یان رەش، یان رەفزە یان پەسند، یا با بژییە یان با بڕوخێ، لەمەش خراتر ئەوەیە رۆژێك پەسندەو رۆژێکی دی رەفزە، رۆژێ بابژییەو رۆژێکی دی با بڕۆخییە.دیارە ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیەو هەر گرووپ و دەستەو میللەتێك وابێ لە کاروانی شارشتانیەت دوا دەکەوێ و ناتوانێ بەشداری لەبەرهەمهێنانی مێژوودا بکات.

بۆ نموونە هیدایەت تا لە ژیاندا بوو هەمیشە بێزاوو دەرکراو بوو. ئەگەر بەگژ دەسەڵاتی باوی ئەدەبی و سیاسی دا نەچووبایە، ئەویش مامۆستایەکی موحتەرەم دەبوو و کتێبەکانی رەواج و بازاڕیان دەبوو، دەیتوانی جێ و رێ و پارەی خۆی هەبێ و پشت بەدایك و بابی نەبەستێ. ئەگەر بەگژ حزبی تودەدا نەچووباو ملی بۆ ئامانجە سیاسییە ستالینییەکان و رچە و رێبازە هونەرییە

جیدانۆفییەکان بدایە، دەریان نەدەکرد و – لەگەڵ کافکادا – بەنائومێدو بەزیوویان حەساو نەدەکرد.

بەرهەر حاڵ هێشتا کفنەکەی بەتەواوەتی زەردنەبوو بووکە ئالەتی بت سازی و بتپەرستی لە چەند لایەکەوە کەوتە کار. بەخۆی لەناو ناوان دا نەمابوو و چیتر لە کەس نەدەبووە مووی لووت، مردنەکەیشی کرا بە شتێکی جوان و شیك و مۆدێلێکی باڵا" ئەوەبوو کە لە زەرق ۲–۳ ساڵ دا هیدایەتی بێزراوی دەرکراوی تەنیا و دەربەدەر بوو بە بتێك کەس جورئەتی نەدەکرد لە گوڵ کاڵتری پێ بڵێ. کار گەییە ئەوە چ بەقسە و چ بە نووسین مەرگی هیدایەتیان دایە پاڵ ئیمپریالزم.

هیدایەت لە رۆژی ۳/دیسەمبر / ۱۹۵۰دا لە تارانەوە رووی کردە پاریس و رۆژی ۹/٤/ ۱۹۵۱ جەنازەکەیان کەشفکرد، هیدایەت بەمەبەستی سەرهەڵگرتن لە ئێران وەدەرکەوت نەك بەمەبەستی خۆکوژی، بەڵام کەبینی رێگەی سەرهەڵگرتن گیراوە، خۆی کوشت.

دوا بەرهەمی چاپکراوی هیدایەت (پیام کافکا)یە کە بێ ئومێدی و بێزاری و بێ تاقەتی هیدایەت بەڕوونی لە بن دێڕەکانی ئە بەرهەمەدا، کە لە ساڵی ۱۹٤۸دا بڵاوبووەوە، بەرجەستەو دیارە.

شەوی ۹/٤/ ۱۹۵۱ جەنازەکەی هیدایەت کەشفکرا پاش ئەوەی هەموو کون و کەلەبەرەکانی بە چاکی گرتبوو، بەلوعەی غازی موبەقەکەی کردبووەوە و لەسەر ئەرزەکە راکشابوو. ئەوانەی کە بوو بوونە مایەی کەشف بوونی جەنازەکەی، ژن و مێردێکی ئەرمەنی ئێرانی بوون کە لە پاریس نیشتەجێ بووبوون،ماڵباتی ئەم پیاوە ئەرمەنییە لە تاران لە نزیکی ماڵی باوانی هیدایەت دوکانی خۆراك فرۆشییان دەبێ، ئەم پیاوە (صادق خان)ی لەوێوە دەناسی. هیدایەت لەو ماوەیەی کە لە پاریس دەبێ چەند جارێك لە ماڵی ئەم ژن و مێردە ئەرمەنییەدا شامی کرد بوو. ئەمجارەیان هیدایەت ئەوانی دەعوەت کردبوو کە ئێوارە بۆ شام میوانی ئەو بن. جا ئەمەی کە ئایا لە کاتی دەعوتکردنەکەدا لێبڕابوو خۆی بکوژێ و ویستبێتی جەنازەکەی لە لایەن ئەوانەوە بدۆزرێتەوە، یان پاش دەعوەتەکە بڕیاری دابوو خۆی بکوژێ ئەمە دیار نییە. بەهەر حاڵ ئەم ژن و مێردە لە دەرکەدەدەن و کەس وەڵامیان ناداتەوە. بەڵام بۆنی غاز دەکەن . ئیدی بەم جۆرە خودانی ماڵەکە پۆلیس ئاگادار دەکاتەوە.

## بەشی دووەم

# سادقی هیدایەت لە دیدی نووسەرانی بیانییەوە

-١-

سادق هیدایەت لە رووی نێوبانگی جیهانییەوە لە زۆربەی نووسەرە ئێرانییەکان بەختەوەرترە. زۆربەی بەرهەمەکانی وەرگێڕدراونەتە سەر زمانە ئەوروپاییەکان. رۆژهەڵاتناسان چ بە وەرگێڕانو چ بە لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانی بایەخی زۆریان داوەتێ.

هەڵبەتە ئەمە شتێکی سەیر نییە، چونکە هیدایەت بە راستی رێبەرو ئاڵا هەڵگری چیرۆکی نوێی ئێرانە، وێڕای ئەوەی چەندین ساڵە مردووە کەچی هێشتاش نەوەی سەردەمی خۆیو ئەوانی پاش خۆیشی سەرەڕای جیاوازی دیدو بۆچوونی فیکری و سیاسیان، هەر شوێن پێی هەڵدەگرنو بەو نموونەیەی دەزانن کە شوێن پێی هەڵبگیرێ. ئاڵاهەڵگرانی چیرۆکی نوێی ئێرانی زۆر بوون، لەوانە: سادق هیدایەت، محەمەد عەلی جەمال زادە، بزرك علوی، سادق چوبكو جەلال ئال ئەحمەد. بەڵام بەڕای رەخنەگرانی ئێرانو ئەوروپاش سادق هیدایەت مامۆستای هەموویانەو بەڕاستی بەداهێنەری چیرۆکی نوێی ئێرانی دێتە ژماردن.

هیدایەت دەربارەی خۆی دەڵێ: "بە هەر حاڵ مێژووی ژیانی من شتێکی سەرنج راکێشی تێدا نییە، رووداوێکی ئەوتۆی تێدا نییە کە شایانی ئاوڕلێدانەوە بێ، پلەو پایەیەکی گرینگم نییە، خاوەن شەهادەو کارنامەی گەورە نیم، لە ژیانی قوتابێتیمدا هەرگیز قوتابییەکی دیار نەبوومە، بەڵکو بەپێچەوانەوە تەمەڵو سەرنەکەوتوو بوومە. بەر پرسیارەکانم لێم رازی نەبوون، رەنگە ئەگەر وازم هێنابا‌و استعفام دابا زۆریان پێ خۆشبایە".

پاش ئەوەی لە ساڵی ١٩٥١داو لە پاریسو لە پرێکا خۆی کوشت، ئیدی خەڵکانێکی زۆر کەوتنە بایەخ پێدانو کۆکردنەوەی بەرهەمەکانیو هەڵسەنگاندنیان.

هیدایەت لە ١٩٠٣/٢/١٧ لە تارانو لەخێزانێکی ئۆرستۆکراتی لە دایك بووە، هیدایەت نەوەی رەزا قولی هیدایەتیە کەدانەرێکی نێوداری ئێرانە ئەوەی دەربارەی ژیانی هیدایەت دەگێڕدرێتەوە ئەوەیە کە هەر لە منداڵییەوە لە ژیانی ئۆرستۆکراسی بێزار بووەو خوا خوای بووە لەو خێزانە دوور بکەوێتەوەو هەرگیز نەیویستووە لە رێگای ئەو خێزانەوە ببێ بە خاوەن پلەو پایەو سەروەتو سامان، ئەگەر بیویستایە دەبوو.

هیدایەت لە ساڵی ١٩٢٥دا خوێندنی ئامادەیی لە قوتابخانەیەکی فەرەنسایی لە تاران تەواو کرد، پاشان نێردرا بۆ بەلجیکا تا ئەندازەی رێگاوبان بخوێنێو ببێ ئەندازیار. پاش ساڵێك هەر لەوێوە لەگەڵ کۆمەڵە هاوڕێیەکیدا گواسترانەوە بۆ فەرەنساو چوونە کۆلیجی ئەندازەی تەلارکاری، بەڵام هیدایەت زوو پەی بەوە برد کە ئەندازەو حەزو ئارەزووەکانی ئەو دوو دنیای جیاوازن، بۆیە خوێندنی باڵای تەواو نەکردو وازی هێنا، هیدایەت زمانی فەرەنسایی بە چاکی

دەزانـی، هـەروەها هـەردوو زمـانی عـەرەبی و ئینگلیـزی بەشـی ئـەوە دەزانـی کـە سـوودیان لـیّ وەربگریّ، پاشان خووی دایە موتالاّکردنی ئەدەبیاتو زانستی زمانو میّژووی هونەرەکان.

هەر چەندە کاری دایـەرەکان لەگـەلّ تەبیعـەت و سروشـتی ئـەودا نـەدەگونجاو وەخـتی زۆری لـیّ دەگرت، بەلاّم چونکە چ ریّگایەکی دی شك نەدەبرد تا بژیّوی خۆی پیّ دابین بکا، بۆیە وەختیّ لـە سـالّی ١٩٣٠دا لـە پـاریس گەڕایـەوە لـە بـانقی میللـی ئیّـران دامـەزرا، پـاش ماوەیـەکی کـەم گواسترایەوە بۆ دایەرەی بازرگانی گشتی، پاشان چووە کۆمپانیای ئینشائات، لە سالّی ١٩٣٧دا نەقلّ بوو بۆ دایەری مۆسیقای میللیو بەشداری لە دەرکردنی گۆڤاری مۆسیقادا کرد، پاشان لـە کۆلیجی هونەرە جوانەکاندا بووە بە وەرگیّڕو تـا سـالّی ١٩٥٠ لەسـەر ئـەم کـارەی بـەردەوام بـوو و هەر لەو سالّەدا چوو بۆ پاریسو ئیدی نەگەڕایەوە.

هیدایەت هیّندە دەست کورت بوو، ناچار بوو بەرهەمەکانی بە چەند نووسخەیەکی کەم چاپو بلاّوبکاتـەوە، یەکـەم چـاپی چـیرۆکی "بـوّف کـور" بـریتی بـوو لـە "١٥٠" دانـە، هـەر چـەندە هەوادارانی زانستو ئەدەبیات زۆریان هـەولّ لەگـەلّدا دەداو دەیانویست یارمـەتی بـدەن، بـەلاّم چ یارمەتییەکی قەبوولّ نەدەکرد.

-٢-

وەختیّ هیدایەت لە سالّی ١٩٣٠ لە پاریس گەڕایەوە، نووسەران: بزرگ علوی، مجتبی مینویو مسـعود فـرزادی ناسـی، ئـەم چـوار نووسـەرە یـەکیان گـرتو دەسـتیان کـرد بـە لیّکۆلّینـەوەی گیروگرفتە ئەدەبیو فیکریو هونەرییەکان. کە ئاشنایەتیو پیّوەندییان زیادی کرد، کۆمەلّەیەکی ئـەدەبییان بـە نیّـوی "ربعـە"وە پیّکهیّنـا، پـاش ماوەیـەکی کـەم کۆمەلّەکـەیان پـەرەی سـەندو ئەنـدامانی دیکـەی وەك پرویـز خـانلری، عبدالحسـین نوشـینو معـین باشـیانو هـی دی لـەدەور خڕبوونەوە.

مینوی سەبارەت بە پرانسیپیی هیدایەتو گروپە ئەدەبییەکەی دەلّیّ: "لە پیّناوی ئازادی خۆدا دەخەبتین، هیدایـەت تـەوەری گروپەکـەمان بوو هەریەکـەمان خۆیبـوونو کەسیّتی خـۆی هـەبوو و خـوانی خۆشەویسـتی هونـەریو ئـەدەبیات کـۆی کردبووینـەوە، ئەمـە جگـە لـەوەی گـەلیّك لایـەنی لیّکچووشمان لە نیّواندا هەبوو، گازینۆو ریستورانەکان جیّگای زۆربـەی کۆبوونـەوەکانمان بـوون، حەز ناکەم قسەکان بەوە لیّك بدەنـەوە کـە جـاڕی خراپـەکاریو ئەنارشـیزممان دەدا- هەنـدیّ جـار زۆرمـان دەخـواردەوە، ئـەوجا دەنگمـان لـیّ هەلّـدەبڕیو قسـەی توندمان دەکرد، رەخنـەی تیـژمان دەگرت، زۆرجار ریّککەوتووە لەسـەر ئـەو دەنـگ هـەلّبڕینو توندوتیژییـە بـەر لۆمـەو تانەوتەشـەری خـەلّکی کـەوتووین، بـەلاّم ئـەم کارەیـان لـەوە تـیّ نەدەپـەڕی کـە فەرمانبـەرانی دەولّـەت یـاری شەترەنجمان لیّ قەدەغە بکەن، یا بۆ هەر شویّنیّ بچین زەلام بنیّرنە تاقیبمان".

هیدایەت لە رۆژگاریّکی یـەکجار سـەختو تـووشو نالـەباری میّژووی ولاّتەکەیـدا گەڕایـەوە، لـە سـالاّنی ١٩٢٠- ١٩٣٠دا بـیّ کـاریو هـەژاریو دەسـت کـورتیو ئـەم بابەتـە ناسـورانە سـەریان کردبـــووە گـــەلانی ئیّـــران، بچـــووکترین نـــاڕەزایی بـــە تونـــدی و لـــە ریّگـــای زەبـــرو زەنگـــەوە دادەمرکیّنرایەوە، دیارە خەباتی قەلّەم بەدەستانیش لە زەبرو زەنگ بەدەر نەبووە.

هیدایـەت ملـی بـۆ زوڵـم و زۆرداری و چەوسـاندنەوە نەدایـە خـەت، بـۆ ئـەوەی لـە گۆشـەگیری رزگاری بیٚ لە ساڵی ١٩٣٦دا رووی کردە هیندستان، لەبەر دەست کورتی و بۆ ئەوەی نەبیٚ بەبار بەسەر دۆستەکانییەوە دوای ساڵێك گەڕایەوە بۆ تاران، تا ئەو کاتە نەیدەتوانی چ بەرهەمێکی خۆی لە تاران بڵاوبکاتەوە.

پـاش ئـەوە "٥٠" نووسـەر گیران و بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕانـە مەحکەمـە کـران و چ تۆمـەتێکی ئاشـکرایان لەسـەر سـاغ نـەبۆوە، بـارودۆخی وڵات ئـاڵۆزتر بـوو، تـیرۆر رووی لـە زیـادی کـرد، هیدایەت هەر بە هیوا بوو و لە ئازادی ئومێد بڕ نەبوو.

بزرگ علوی لـە وتارێکیا دەربارەی هیدایـەت دەڵـیٚ: "هیدایـەت پیـاوی بـەرگری و خـەبات بـوو، دۆسـتەکان چـاك دەزانـن هیدایـەت لـە رۆژگـاری تەنگانـەداو لـەو سـەروبەندەدا کـە هێـزی شـەڕو تاریکی زاڵ بوو، چۆن بە دڵ و گیان ژانی ئازادیخوازانی دەلاواندو خۆی خستبووە تالوکەوە".

هیدایەت لـە ماوەی ئـەم دە ساڵە دژوارەدا خـەباتی فیکری خـۆی بـۆ رەخنـەی ئـەدەبی تـەرخان کردو بیروبۆچوونەکانی خۆی لە رێگای رەخنەوە خستەڕوو، ئەوەی سەلماند کە چەند لە گەلـەوە نزیکە، چەند بە وردی و قووڵی لە دەقە فارسییەکان گەیشتووە.

لـە سـاڵی ١٩٤٢دا کتـێبی "ترانـەهای خیـام"ی بڵاوکـردەوە، پێشـەکییەکی تێـرو تەسـەلی بـۆ نووسـی و لـەو پێشـەکییەدا جگـە لـە باسـی ژیـان و بەرهەمـەکانی شـاعیر، باسـی بۆچـوونە ئیلحادییەکان و ئازایـەتی شـاعیری کردووە کـە چۆن توانیویـەتی پۆخڵـەواتی کۆمەڵگاکـەی خـۆی بخاتەڕوو، ئەوجا وەکو یەکێك ژێراوژێر بە گومان و ئیلحادی شاعیر خۆشحاڵ بیٚ، پشتیوانی لـەم بۆچوونەی دەکا کە دەڵیٚ:

ئەگەر ئەوانەی هێشتا نەهاتوونە دنیاوە

دەزانن حاڵمان چییە بەدەست رۆژگارەوە

هەرگیز نایەن.

وتاری: "چەند پەیڤێك لەمەڕ وەیس و رامین" لێکۆڵینەوەیەکە کە لـە پشت ئـەم چیرۆکە کۆنـەوە گـەلیٚ مانـای نەتـەوەیی لەگـەڵ خۆیـدا هـەڵگرتووە، هیدایـەت کـە دەسـتی بـە کۆکردنـەوەو لێکدانـەوەی هونـەرە میللییـەکان کـرد، تـوانی سـەرنجی خـەڵکیان بـەلادا رابکێشێت. لـە سـاڵی ١٩٣١دا نامیلکەیـەکی بچـکۆڵەی بـەنێوی ئەفسـانە بڵاوکـردەوە کـە بریتییـە لـە شـیعرو گـۆرانی و مەتـەڵ و وازی میللـی، لـەم نامیلکەیـەدا ئامـاژەی بۆ ئـەوە کـردووە کـە: "دەسـتووری شـیعر لـەلای رەمـەکی مـەردم هێشـتا رێچکـەی بـەر لـە ئیسـلامی بەرنـەداوە". هیدایـەت تـوانی بایـەخی هونـەری میللی بخاتەڕوو، و گەلیٚ لێکۆڵینەوەی لەم بارەیـەوە لـە گۆڤـاری "سخن"دا بڵاوکردەوەو زۆربـەی نووسەرانی گرووپی "ربعە" لەم رووەوە یارمەتیان داو هاوکاریان لەگەڵ کرد.

لەو سەروبەندەدا کە لە هندستان بوو، زۆر لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلی دەربارەی زمـانی کـۆنی ئێرانـی "پەهلـەوی" نووسـی و لـە سـاڵی ١٩٣٦دا چـەند وتـارێکی دەربـارەی زانسـتی زمـان بڵاوکردەوە. لە ساڵی ١٩٣٩دا نامیلکەی "نـەفرەتی زینـدوو"ی لە پەهلەوییـەوە کردە فارسی، لـە هـەمان سـاڵدا قورسترین کتـێبی ئـەم مەیدانـەی بڵاوکـردەوە کـە بریتییـە لـە لێکدانـەوەی مـەزنترین دەقی ئەدەبی فارسی ناوەڕاست "پەهلـەوی" بەناونیشـانی "کارنامـەی اردشیر بابکـان" لـە سـاڵی

۱۹٤۳دا کتێبی "یادگار جاماسب"ی لە پەهلەوییەوە کردە فارسی کە هەندێ خاڵی ئایینی تایبەتی دەربارەی ئێرانی کۆن تێدایە.

هەموو ئەم کارانە هەستی نەتەوەییان لەلای سادق هیدایەت قووڵ کردەوە. لە ساڵی ۱۹٤۰دا گەلێ گفتوگۆ کەوتە نێو رۆشنفکرانی ئێران دەربارەی چاك کردنی ئەو ئەبجەدییە ئێرانییەی کە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە. هیدایەت وتارێکی تێرو تەسەلی بە نێوی "خەتی پەهلەوی‌و ئەبجەدییەی فۆنەتیك" نووسی‌و لە کۆتایی وتاری نێوبراودا ئەوەی دەست نیشان کردووە کە گۆڕینی ئەبجەدییەی ئێستای فارسی کارێکی پێویستەو دەبێ لە پاڵ رەچاوکردنی کەڵك وەرگرتن لە زانستی فۆنەتیك پشت بە ئەبجەدییەی لاتینی ببەسترێ. هیدایەت هەر لەو وتارەدا سەرنجی خەمخۆرانی ئەو مەیدانەی بۆ ئەزموونی تۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست‌و ئازربایجانی شورەوی راکێشاوە.

هیدایەت گەلێك نووسینی هەن دەربارەی ئینسانیات‌و هونەرەکانی ئێران، لەوانە وتاری: "هونەری ئێرانی لە ژووری میدالیاتدا"، کتێبی "نیرنگستان" کە دەربارەی بیروباوەڕی میللی‌و پەندی پێشینان‌و عادەت‌و رەوشتی ئێرانییەکانە، کتێبی: "اصفهان نصف جهان" کە دەربارەی بارودۆخی تەبیعەتی ئەسفەهان‌و شوێنەوارو هەواڵی خەڵکانی وێندەرە.

چاك بوون‌و بووژانەوەی بارودۆخی رامیاری لە نێوان ساڵانی ۱۹٤۲– ۱۹٤٥دا یارمەتی گەشەکردنی هونەری گەلێ نووسەری بەهرەمەندی ئێرانیدا. هیدایەتیش لەم سەروبەندەدا ئەستێرەی کەوتە بەرزی‌و لە زۆربەی خەباتگێڕە کۆمەڵایەتییەکان کارامەتر بوو. خۆی‌و گەلی چەوساوەی بە تامەزرۆی پاشەڕۆژی ئازادی دەناسی. لە ساڵی ۱۹٤۲ـەوە گەلێك چیرۆك‌و کورتە رۆمانی بڵاوکردنەوە کە بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ پۆخڵەواتی کۆمەڵایەتی گەلی ئێران کردبوو، وێڕای ئەوەی پێوەندی نێوان ئێران‌و شورەوی هەمیشەو بە بەردەوامی بەرقەرار نەبووە، بەڵام هیدایەت هەمیشە لەو روانگەیەوە روانیویەتی سەربەستی‌و پیرۆزی‌و رەسەنی فیکر کە هەڵقوڵاوی ناو جەرگەی گەل بن. بەشداری تەواو کردنی کارەکانی کۆمەڵەی پێوەندی زانستیی نێوان ئێران‌و شورەوی کرد، هەندێ لە نووسین‌و وەرگێڕانەکانی لە گۆڤاری "پیام نو"دا کە ئۆرگانی کۆمەڵەی نێو براوبوو، بڵاوکردەوە. لە ساڵی ۱۹٤٤دا بەرەزامەندییەوە بانگهێشتی بەشدار بوونی لە ئاهەنگی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی زانستگای تاشقەند قەبووڵ کرد، پاش ئەوەی دوو مانگ لە ئۆزباکستان مایەوە، خۆشحاڵی خۆی سەبارەت بە پێشکەوتنی هونەرو زانست‌و ئەدەبیات لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاستی شۆڕەوی دەربڕی. لە ساڵی ۱۹٤٦دا یەکەم کۆنگرەی نووسەرانی ئێران لە سایەی دروشمی: "خەبات لە پێناوی ئەدەبیاتی نوێ‌و پرشنگدار"دا بەرپا کراو هیدایەت بەشداری تێداکردو یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەو دەستەیەی کە سەرۆکی کۆنگرەیان هەڵبژارد، بۆ یەکەمجار زۆربەی نووسەرانی نێوداری ئێران لەو کۆنگرەیەدا گردبوونەوە تا باسی گیروگرفتە بنەڕەتییەکانی ئەدەبیاتی فارسی بکەن، بە تێکڕای دەنگ لەسەر ئەوە رێککەوتن کە کار لە پێناوی خزمەتی گەل‌و رۆشنبیرانی گەلدا بکرێ.

ئەم ئازادییە زۆری درێژە نەکێشا، ئەوە بوو لە ساڵانی ۹٤۷– ۹٤۸داو لە ئەنجامی رووداوەکانی ئازربایجانەوە جارێکی دی هێزە فکرییەکان کەوتنەوە ژێر فشارو سانسۆر. تووڕەیی هیدایەت بوو بە نائومێدی و خەم، ئەوە بوو "پیام کافکا"ی بڵاوکردەوە. هەندێ لە رەخنەگران

پێیـان وایـه ئـەم بەرهەمـەی هیدایـەت جـۆرە جارِدانێکـە بـۆ گەڕانـەوەی هیدایـەت بـۆ باوەشـی نائومێدییە کۆنەکەی، هەندێکی دی وای دەبینن گوایە دژ بەوانە بوو کە راپەڕێنی چەپیان لە ئێراندا رێکخست، بەڵام وەختێ گەلی ئێران راپەڕیو داوای ئاشتیو ئازادی کرد، هیدایەت بە دڵو بـەگیان تێـدا بـوو، بـەڵام بـەهۆی گیروگـرفتی دەوامـی دایـەرەوە نـەیتوانی بـە دەنگـی "جولیوکوری"یەوە بچێ تا لە یەکەم کۆنگرەی ئاشتی جیهاندا بەشداری بکا، ئەوە بوو بۆی نووسـی: "ئیمپریالیسـتان وڵاتەکـەمانیان کـردووە بـە زینـدانێکی گـەورە، قسـەکردن تاوانـە، بیرکردنەوەی دروست تاوانە، پیرۆزبایی کۆششی ئێوە لە پێناوی بەرگری لە ئاشتی دەکەم".

-٣-

(باسـتور فـالیری رادو)ی رەخنـەگری فەرەنسـاوی پێـی وایـە وەخـتێ بەرهـەمی هیدایـەت دەخوێندرێتـەوە سـێ نـاو دێنـە بـیر: دوستوفسـکی، ئـەدگار ئـالن پـو، کافکـا، ئەمـەی دواییـان پێویستی بە هەڵوەستەیەکی تایبەتی هەیە.

ئەوی راستی بێ هیدایەت لە گەلێ سەرچاوەو رێبازەوە بەرهەمی وەرگێراونەتە سەر زمانی فارسی یەکەم کەس بوو کە بەرهەمی چیخەف وەرگێڕایە سەر زمانی فارسی، لە ساڵانی ٩٣٢-٩٣٤دا هەنـدێ لـە چـیرۆکەکانی چـیخەف کـردن بـە فارسـیو بـڵاوی کردنـەوە، بـەڵام بـە زۆری بەرهەمـەکانی کافکـای وەرگێـڕا، مسـخو محاکەمەکـەی وەرگێـڕاوەو لـە سـاڵی ١٩٤٨دا پـەیامی کافکای بڵاوکردەوە کە لەو نووسینەدا پشتیوانی رەفزی ژیان لەلای کافکا دەکا، شتێکی بەڵگە نەویستە کە هیدایەت زۆر دڵبەندی سارتەر بووە، بە تایبەتی کتێبی "هێلَنج" هەروەها چیرۆکی "دیوار"ی کردە فارسی.

خوێنـەر وای بـە خـەیاڵ دێـت کـە هەنـدێ دەسـتەواژەی هیدایـەت لـە بەرهەمـەکانی سارتەرەوە وەرگیراون وەك:

"تاریکی.. ئەو مایە خەستە شلەی گشت شوێنو شتێ دەلەوتێنێ"، ئاخۆ دۆزەخ لە کورتە رۆمانی "بوف کور"ی هیدایەت هێمایە یا سێبەری ئەو پیاوە نییە کە خۆی لە چوار دیواری ژوورەکەیدا زیندان کرد.... ئاخو ئەوە دۆزەخەکەی سارتەرمان وەبیر نایەنێتەوە؟"

هنری ماسیە بەراوورد لە نێوان هیدایەتو جیرادی نرفالی نووسەری فەڕەنسایی دەکا، هەموو ئـەو هەسـت و نەسـتانەی دەربـارەی نرفـال زانـراون لـەلای هیدایـەتیش ناسـراوەو زانـراوە، ئـەو لێکچوونەی لە نێوان بەرهەمەکانیاندا بەدی دەکرێ دەگەڕێتەوە بۆ لێکچوونی ژیـانی تایبـەتی هـەردووکیان، دیـارە لێکچـوونی بەرهەمـەکانیان ناگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی هیدایـەت کەوتبێتـە ژێـر کارتێکردنی ئەوەوە، روجیە لیسکو جارێ هیدایەت لە تاران دەبینێو لێی دەپرسـێ: "جیرار دی نرفال"ت ناسیوە؟ لە وەڵامیا دەڵێ: بەڵێ، بەڵام بەداخەوە زۆر درەنگ ناسیم.

هیدایەت وەرگێڕانی بەلایەنێك لە چالاکییە هونەرییەکانی خۆی زانیوە، بۆیە وەرگێڕانەکانی رەوانو بێ گرێو جوان بوون.

گریسنسـن-ی رۆژهـەڵاتناس بـەخۆی دەڵـێ جارێکیـان -بـە پێچـەوانەی کـارە زانسـتیو لێکۆڵینەوە قەبەکانی- کۆمەڵە چیرۆکێکی ئێرانی بەزمانی فەرەنسی نووسیوەو ناردوویەتی بۆ

دەستەی نووسەرانی گۆڤاری "سخن"و داوای کردووە هیدایەت بیانکا بە فارسی، هیدایەتیش هەندێکی لێ وەرگێڕانو پێشەکیو روون کردنەوەی بۆ نووسیون.

هیدایەت ئاوێتەیەك بوو لە رۆشنبیریی ئێرانی کۆنو رۆشنبیریی ئێرانی ئیسلامی، لە پاڵ لێکۆڵینەوەی "ترانەهای خیام"دا، لە چیرۆکە زۆرو زەبەندەکانیشیدا گەلێ شیعری فارسیو قسەی نەستەقو پەندی پێشینانو رستەی خوازراو لە کەلەپورەوە بەدی دەکرێن، چیرۆکی "ئەو پیاوەی خۆی کوشت" چاکترین نموونەیە بۆ ئەو رایەمان.

-٤-

کمیسرۆف-ی رۆژهەلاتناسی شورەوی ئەو "١٠٠" بەرهەمە ئەدەبییەی هیدایەت کە لەماوەی ٢٢ ساڵدا نووسینی دابەش دەکا بەسەر دوو قۆناغدا، قۆناغی یەکەم: ١٩٢٥- ١٩٤١، قۆناغی دووەم: ١٩٤٢- ١٩٥٠.

"زەندە بگور" یەکەم چیرۆکی هیدایەتە کە لە ساڵی ١٩٢٩دا لە پاریس بڵاوکرایەوەو پاشان لە هەمان ساڵدا لەگەڵ کۆمەڵە چیرۆکێکی دیدا کە لە پاریس نووسیبوونی بە هەمان ناوونیشان "زەندە بگور" بڵاوی کرەوە، لە ساڵی ١٩٣١دا کۆمەڵە چیرۆکی "انیران"ی بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٣٢دا کۆمەڵە چیرۆکی "سەقترە خون"ی کە بریتییە لە پازدە چیرۆك بڵاوکردەوە، لە ساڵی ١٩٣٣دا چیرۆکی "علویە خانم"ی بڵاوکردەوە کە پڕە لە وەسفی عامیانەو گفتوگۆی میللی. لە هەمان ساڵدا کۆمەڵە چیرۆکی "سایە روشن"ی کە بریتییە لە حەوت چیرۆك، بڵاوکردەوە. دیارە نرخو بایەخی هونەری ئەو سێ کۆمەڵە چیرۆکە لە یەك ئاستدا نین، لە ساڵی ١٩٣٤دا لە تاران نامیلکەی "وغ وغ ساهاب"ی بڵاوکردەوەو ناوی خۆی لەسەر دانەنا، کەچی هەر زوو زانرا کە ئەم نامیلکە پڕ لە داشۆرینو پلارو توانجە دژ بە لێکۆڵینەرو زاناو وەرگێڕو نووسەرو بڵاوکەرەوەو کتێب فرۆشانی ئەو سەردەمە تەنیا لە نووسینی نووسەرانی وەك سادق هیدایەتو مەسعود فەرزاد دەچێتو هەر قەڵەمی وان شتی ئەوەندە بەبرشتی لێ دەوەشێتەوە. لە ساڵی ١٩٣٦دا کورتە رۆمانی "بۆف کور"ی بۆ یەکەمجار لە شاری بومبی بڵاوبووەوەو سەرکەوتنێکی چاکی وەدەست هێنا، پاشان لە ساڵی ١٩٤١دا لە تاران چاپی دووەم کرایەوە.

هیدایەت لەو سەروبەندەدا کە لە بومبی بوو دوو چیرۆکی بە زمانی فەرەنسی نووسین، "گیّژاو، رین" مونتیە دەڵێ: چیرۆکی دووەمیان لە ژمارە دووی جورنال دی تهران بڵاوکرایەوە، بەڵام چونکە دەستەی نووسەرانی رۆژنامەی نێوبراو دەستکاری دەقەکەیان کردبوو ئیدی هیدایەت زویر بوو و داوای کرد چیرۆکەکەی دیکەی بڵاونەکەنەوە، پاشان هەردوو چیرۆکەکە لەگەڵ وەرگێڕانی فارسییاندا لە ساڵی ١٩٥٤دا لە کۆمەڵە چیرۆکی "پروین دختر ساسان"دا بڵاوکرانەوە.

کارتێکردنی ئەدەبیاتی ئەوروپاو رۆژئاوا لەم ماوەیەدا بە ئاشکرا بە هونەری هیدایەتەوە دیارە، ئەم کارتێکردنەش بە روونی لە کۆمەڵە چیرۆکی "سایە روشن"دا دیارە، بەتایبەتی لە چیرۆکی: "عروسك پشت پردە"و "افرینگان".

هیدایەت چیرۆکی دی هەن کە رەنگدانەوەی بارودۆخی نیگەرانی رۆحن، هەمیشە وایان باس دەکا کە ئاوێتەیەکن لە هەژاریو شۆڕشو نەخۆشی، لەم ماوە بەپیتو بڕشتەی چالاکی

هونەریـدا سـەیر دەکـەین هیدایـەت بـە ئاشـکرا روو دەکاتـە واقیـع، لـە کۆمەڵـە چـیرۆکەکانیا بـە راستگۆیی تەواوەوە وەسفی ئەو پاڵەوانە ئێرانیانە دەکا کە رووبەڕووی پۆخڵەواتی کۆمەلایـەتی سـەردەم دەبنـەوە وەکـو چیرۆکی: "ئـەو ژنـەی مێردەکـەی ون کـرد" لـە کۆمەڵـە چیرۆکی "سـایە روشن"دا، هەروەها چیرۆکی "محلل" لە کۆمەڵە چیرۆکی "سەقطرە خون"دا هەڵبەتە رەخنـەگران راو بۆچـوونی جیاوازیـان دەربـارەی روانگـەی هیدایـەت بـۆ ژیـان لـە ئـەدەبو هونـەری ئـەم سەردەمەیدا هەیە، رەخنەگرە فەرەنساوییەکان پێیان وایە هیدایەت نائومێدی و رەش بینی لە نێـو خوێنـەرەکانیا بلاودەکاتـەوە، بەڵگەشـیان چیرۆکی: "زنـدەبگور"و رۆمـانی "بـوف کـور"ـە. قارەمانی چیرۆکی "زنده بگور" خەڵقەندەیەکی بێ هیوایە، چ ئومێدێکی بە ژیان نەماوە گەرچی بەجەستە زیندوووە، بەلام دەروون مردووە.

گەلێك دەستەواژەی تووڕەیی و رەفزو بێهودەیی ژیان لە چیرۆکی هیدایەتدا بەرچاو دەکەون، لـە چـیرۆکی "زنـــدە بگـــور"دا قارەمانەکـــە بـــەغاز خـــۆی دەکوژێـــت، هـــەر چـــەندە رەخنـــەگرە فەرەنساوییەکان پێیان وایە ئەم چیرۆکە سەراپا رەشبینییە، کەچی کمیسرۆف بە پێچەوانەوە پێی وایـە ئـەم دوو بەرهەمـە رەنگدانـەوەی سـەر لەبەری بەرهەمـەکانی نووسـەر نینو رەخنـەگران ئاوڕیـان لـە هەنـدێ وردەکـاری نـاو ئـەو چیرۆکانە نەداوەتـەوە کـە گـەلێ شـتی نهێنی دەربـارەی پاڵەوانـەکانی بەرجەسـتە کـردووە، چـیرۆکی "زنـدەبگور" بـەم شـێوەیە دەسـت پێـدەکا: "گـۆج و ئیفلیج و بێ جوولە لە جێدا کەوتووم، بە ئاستەم هەناسە دەدەم، فرمێسك بە چاوما دێنە خوارێ، دەمـم تاڵـە، سـەرم دێشـێ و جەسـتەم شـەکەت و نـەخۆش و کـە نەفتـە.." ئـەم خەڵقەنـدە کلۆڵـە نائومێدە، لە مەرگ دەگەرێ، مـەرگ بـەو شتە دەزانێ کە لـە ژان و ئازارەکـانی رزگـار دەکا، خـۆی ئـازار دەدا، دەیـەوێ ژەهـر بخـوا، بـەلام مـەرگ نـاتوانێ سـنوور بـۆ تواناکـانی دابـنێ، وەخـتێ قارەمانەکـە لـە خـۆی و ئازارەکـانی بێـزار دەبـێ و ئـازار تـەنگی پـێ هەڵدەچـنێ هـاوار دەکـا: "بیرم کەوتەوە کە ئاگر لـە دەوروبـەری دووپشك دەکەنـەوە، بـە خۆیـەوە دەداو خـۆی دەکوژێ! ئایـا مـن بازنەیەکی ئاگرم بە دەورا نەکێشراوە؟".

رووداوەکـە لـە رێگـای رانـاوی قسـەکەرەوە، دەگێڕدرێتـەوە، بۆیـە هـەموو رەخنـەگرەکان وای بۆچـوون کـە ئـەم چیرۆکە ژیاننامـەی نووسـەر خـۆی بـێ، وای تێگەیشـتوون کارەسـاتێکی فـەردی تایبەتی نووسەرە، رەنگە ئەم رەنگە ئەم بۆچوونە لە گوین بێ و زادەی ئەو حاڵەتە بێ کە نووسـەر لـە سانسـۆری سـەر بەرهەمـەکانی دەترسـا. بـەلام رەوتـی گشـتی چـیرۆکەکە ئـەو بۆچـوونە رەت دەکاتـەوە، دەنگـی رەفـزو نائومێـدی لـەم چیرۆکەدا، خـۆی لـە خۆیـدا رەفـز کردنـی ژیـانی پـڕ لـە شەکەتی و ماندێتییە، ئـەم زینـدووە نـاتوانێ لـە گۆڕسـتانی زۆرو ستەمدا بژی، کێشـەو ململانێـی نێوان چاکەو ژیان و مەرگ تێکەڵ بە بوونی بووە، هەندێ جار وەئاگا دێتەوە، کە لاوازی ویسـت و ترسـنۆکی خـۆی دەبیـنێ دەکەوێتـە سەرزەنشـت کردنـی خـۆی و پـرۆژەی ژیـانێکی نـوێ دەخاتـە بـەردەم خـۆی و چـاو دەبرێتـە ئاسـۆی ژیـانێکی چـاك و پـڕ لـە سـەرفرازی، ئـەوجا چەشـنی ئەسفەندیاری قارەمـانی نـاو شـانامەکەی فیردەوسـی دەکەوێتـە وەسـفی خـۆی... بـەلام دەرفـەتی ژیـانی ئـازادو داهێنـانی هونـەری بـۆ نارەخسـێ، هەرچـی شـتی چاکە هەیـە لەخۆیـدا دەیکـوژێ و دەبێ بە مردوویەکی زیندوو.

هەر چەندە کمیسرۆف بەرگری لە ئامانجی چیرۆکەکە بکا، هەرگیز ناکرێ گیانی رەش بینی لە تەواوی بەرهەمەکانی هیدایەتدا، بەتایبەتی لەم ماوەیەدا فەرامۆش بکرێ، ژیانی بەلاوە پووچە، زۆربەی قارەمانی چیرۆکەکانی بەزیوو هەلاتوون. نموونەی بەزینو هەلاتن لە گەلێ چیرۆکیدا دووبارە دەبێتەوە وەك چیرۆکی "لالە، صورتکها، گرداب، سایە، مغول، محلل"، ژیان لەلای هیدایەت بنکەی سەرنەکەوتنە، تێکڕای قارەمانەکانی دەجەنگنو بەشیان سەرنەکەوتن دەبیو لە ئاکاما دووچاری یەك جۆرە نائومێدی دەبن، دەڕووخێنو دەربەدەرو ئاوارە دەبن یا زۆربەیان لە رێگای خۆ کوشتنەوە دەست بەرداری ژیان دەبن. هەندێ جار کە شۆڕش لە چیرۆکەکانیا بەرپا دەبێ، تەمەنی زۆر کورتەو چەشنی بلقی سەر ئاو زوو بە زوو دەنیشتێتەوە، چاکترین دیاردەی ئەم ئەلها رەش بینییە ئەوەیە کە هیدایەت بە عەشقەوە نێوی مەرگ دەبات. قارەمانی چیرۆکی "زندە بگور" کە هاتۆتەدنیاوە، ئامادەییەکی تەواوی هەیە بۆ مردنو هاوار دەکات، "چ کەسێ، نییە فێری نەخشەدانان بێ بۆ خۆ کوشتن، خۆ کوژی لەلای هەندێ کەس تێکەڵ بە مۆخیان، بە رەچەلەکیان و بە سروشتیان بووەو ناتوانن لێی لابدەن، ئیدی حوکمی قەدەرە....".

قارەمانی چیرۆکی "قەلای نەفرەت لێکراو" دەڵێ: "هەموو هەر تەنیاین.. پێویست ناکا هەڵخەڵەتێین، ژیان زندانە، بەڵکو کۆمەڵە زندانێکی جیاوازە بەلام هەندێکمان هەوڵ دەدەین دیوارەکانی ئەم زندانە بنەخشێنین، بەوەش دەمانەوێ ئولفەتی لەگەڵ بگرین، هەندێکی دی هەوڵ دەدەین هەڵێینو بە خۆڕایی دەستی خۆ بریندار دەکەین، هەندێکی دی دەیکەین بە پرسەخانە... بەلام کاکڵەی شتەکە ئەوەیە دەبێ خۆ هەڵخەڵەتێنین... بەلام وەختێ دێ مرۆڤ لە خۆ هەڵخەڵەتاندنیش بێزارو وەڕس دەبێ تەنانەت مەرگیش چ لە زەتێك لەگەڵ خۆیدا هەڵناگرێ، بەڵکو لەزەت لە نەمانی گشتی دایە... هەر لەسەر هەمان نەزم سەیر دەکەین لە چیرۆکی "افریندگان"دا رۆحەکان کۆدەبنەوەو موناقەشە دەکەنو ئەوە روون دەبێتەوە کە چ شتێ نییە بەنێوی پاداشت یا سزاوە، رۆحیش دەمرێ.

گرینگ نییە هیدایەت رەش بین بێو چ رەخنەگرێکیش هەقی ئەوەی نییە داکۆکی لێ بکا، رەش بینی تۆمەتێك بوو دەدرایە پاڵی، هەڵوێستێکە بەرانبەر بە ژیان وەکو هەر هەڵوێستێکی دی کە خەڵکانی دی دەینوێنن، هیدایەت توانی قۆناغی دووەمی ژیانی ئەدەبی خۆی لەسەر بناغەی تەنزو ساتیر بینا بنێو خەوشەکانی کۆمەڵ بخاتە بەرچاوان.

هیدایەت لە قۆناغی دووەمی چالاکی ئەدەبی خۆیا بەلای ریالیزمدا دای دەشکێنێ، گیروگرفتی کۆمەلایەتی زەقو کێشەکانی خەڵکیو نیشتمان کۆڵەگەی چیرۆکی ریالیستی ئەم سەردەمە بوون، گۆڕانی بارودۆخی ئێران لەو سەردەمەدا زەمینەی گەشەکردنی شەپۆلی ریالیستی لەلای هیدایەت خۆشکردو وای لێهات کە زۆربەی بەرهەمەکانی لە جەماوەرەوە هەڵدەهێنجا.

هیدایەت لە ساڵی ١٩٤٣دا کۆمەڵە چیرۆکی "سگو لگرد"ی بلاوکردەوە، لە گەرمەی دووەم شەڕی جیهاندا، یانی لە ساڵی ١٩٤٤دا کۆمەڵە چیرۆکی "ولنگاری"ی بلاوکردەوە. ئەم کۆمەڵە چیرۆکە چیرۆکی وای تێدایە پڕ لە هێماو وروژاندنی بیرو گوزارشت کردن لە مەیدانەکانی ژیانی رۆژانەو رەخنەگرتن لە چینی بۆرژوا، هیدایەت لە چیرۆکی "اب زندگی"دا پشتیوانی لە هێزە پێشکەوتوخوازەکان دەکا کە لە ململانێیەکی خوێناوێدا بوون دژ بە فاشیزمو نازیزم، لە ساڵی ١٩٤٥دا رۆمانی "حاجی اقا"ی بلاوکردەوە کە لە رووی قەوارەوە قەبەترین بەرهەمێتی. هیدایەت

لـەو چـیرۆکەدا هێـرش دەکاتـە سـەر کۆنەپەرەسـتێتی ئێـران و لەشەخسـیەتی بازرگـانێکی شـێوە کـۆن و نـەزان و چەوسـێنەردا دەیخاتـەڕوو، چـیرۆکی "فـردا"ش گوزارشـتە لـە ژیـان و گـوزەرانی سەخت و دژوارو نالەباری کرێکارانی ئێران.

"تۆپ مروارید" چیرۆکێکی تری هیدایەتە کە دوای مردنی خۆی بڵاوبووەتەوەو لەو چیرۆکەیدا بە ئاشکرا گاڵتە بە ئیمپریالیزم و سەرمایەداران و کلکەکانیان دەکا. هەر چەندە هیدایەت بەر لە خۆ کوشتنەکەی گەلێك لە بەرهەمەکانی خۆی سووتاندووە، بەڵام گومانی تێدا نییە کە هەندێ نووسین و نامەی لەلای خزم و دۆستەکانی ماون و لێکۆڵەرەوانی ئەدەبی هاوچەرخی فارسی بە تەواوی نائومێد نەبوون لە دۆزینەوەو بەدەست هێنانی ئەو بەرهەمانە، ئەوی راستی بێ هەندێ لـەو بەرهەمانـە بڵاوبوونەتـەوە، لێکۆڵـەرەوەکان بایـەخێکی زۆر بـە بڵاوکردنـەوەی، کەلـەپووری هیدایـەت دەدەن و دەیانـەوێ پێناسـەیەکی بابەتیانـەی تـەواوی بەرهەمـەکانی بدەنـە دەسـتەوە. ئەوەی لـە بەرهـەمی ئـەم سـەردەمەی هیدایەتدا دەبینـرێ ئەوەیـە کـە دژی داگیرکـەرانی بێگانـەو بنەماڵەی فەرمانڕەوایەو هەوادارو لایـەنگری گـەلی چەوساوەی نێـو کێڵگـەو کارخانانـە.... پـێ دەچێ هەوڵی دابێ هاووڵاتیان بۆ بەرگری لە نیشتمان هان بدا.

هەردوو شانۆگەری: "پروین دختر ساسان"و "مازیار" پڕن لـە هەسـتی نیشـتمانپەروەری، هـەر چەندە رووداوەکانیان باسی رابوردووە، بەڵام ناوەڕۆکیان باسی ئێستایە. ناوەڕۆکی راستەقینەی ئـەو دوو شـانۆگەرییە بریتییـە لـە کێشـەی ئێرانییـان و خـەباتیان دژ بـە داگیرکـەرانی بێگانـە، هیدایەت هەر بەوەوە نەوەستاوەو هێرشی کردۆتە سەر نیشتمانپەروەری ساختەش.
چیرۆکی: "میهن پرست"ی هێرشـە بـۆ سـەر نیشـتمانپەروەری سـاختەو ریـاو ریاکـاری و لاف و گـەزافی گەوجانـەو بـۆش و بـەتاڵ، ئـەو شـتانە لـە سـاڵەکانی سیدا لـە ئێـران ببـوون بـە مـۆدو بـاو. هیدایەت شان بەشانی جاڕدانی بیری نەتـەوەیی و جۆشـدانی هەسـتی میللی، قینی خۆی بەسـەر ئیمپریالیزمیشدا دەڕێژێ و لە: "خردجال"دا چینی بۆرژواو دەوڵەمەندان وەکو کەرو گورگ و مەڕ تەماشا دەکا، بە تایبەتی ئەو دەوڵەمەندانەی بەلایانەوە گرینگ نییە نۆکەری هەر کەسێ بکەن بە مـەرجێ جێـی خۆیـان لـەق نـەبێ و بەرژەوەنـدییان نەکەوێتـە خەتـەرەوە، هـەر لـەو چـیرۆکەدا ئیشارەتی ئاشکرای تێدایە بۆ نۆکەرانی ئینگلیزو ئەوانەی هاوکاریان لەگەڵ دەکەن، هـەروەها بـە بـەردەوامی هێرشـی کردۆتـە سـەر تـەماح و هەڵپـەی ئـەمریکا لـە ئێرانـدا، لەچـیرۆکی "فـردا"دا نووسـەر بـە زمـانی کرێکـارانی کارخانـەوە لـە سیاسـەتی ئیمپریـالیزم و دەسـەڵاتی سـەرمایەداران دەدوێ و ئەوە دەگێڕێتەوە کـە چـۆن سـەربازێکی بەدمەسـتی بێگانـە ژنـە ئێرانییـەك دەفڕێنێ و چ کەسێك لە پیاوانی دەسەڵاتی سوپایی داکۆکی لە ئافرەتەکە ناکەن و وەختێ کرێکارێك بە جواب دێ و دەیـەوێ ئافرەتەکـە رزگـار بکـا، سـەربازی بێگانـە دەیگـرن و دەیبەنـە شـوێنێکی دوور، نیوەگیـانی دەکـەن و پاشـان بـۆ مـاوەی سێ مـانگی خشـت دە زینـدانی داوێـن، ئایـا ژنەکـە لێـرەدا رەمـزی ئێـران نییـە؟ بـۆ زیـاتر ناسـینی هەسـتی هیدایـەت بەرانبـەر بـە ئیمپریـالیزم دەتـوانی بـە سەرنجەوە سەیری دوا بەرهەمی بکەی واتە "توپ مروارید" لەم بەرهەمەیدا دەڵێ: "

"کۆلـۆمبس بـەنیازی داگیرکردنـی زەوی تـازە کەوتـەڕێ، تووشـی چەرمەسـەری زۆر هـات، ئاژووقەی هاتـە کـزی و تـەواو بوون، چ تارماییـەکی زەوی و وشـکایی بـەدی نـەکرد، نائومێدی

بەسەریا زاڵ بوو، وای لێهات ئامادەبوو دەست بەرداری گەشتەکەی ببێ و بگەڕێتەوە بەمەرجێ تیا نەچێ و بەزیندوویی بمێنێ، کوتوپڕ کەناری لێ بەدیار کەوت، سەیری کرد کاپتنە نیشتمان پەروەرەکان دەوری تۆپێکی بەرزیان داوە و دەرەقسن و هەڵیان کردۆتە گۆرانی و ستران، لە پڕ تۆپەکە ناڵەی کرد، دەریاوانەکانی سەر کەشتییەکە هەموو بەلادا هاتن و شەپۆڵ هەڵی لوشین. کۆلۆمبس زۆر ترسا، هاوکارەکانی خۆی تێگەیاند جۆرە فێڵ و دەهویەکی شەڕە لای عەرەب، ئەوجا گەیاندنییە کەنارو ئالآی سپیان هەڵکرد. کۆلۆمبس رووی تێکردو گوتی: بڕیارم دابوو کەلێنێکی گەورەتان تێ بخەم، بەڵام چونکە گەییوومەتە ولاتێکی دۆست ، ئیدی ئامادەم بێ هیچ مەرجێ خۆم بەدەستەوە بدەم، دەم راستی هۆزی هندە سوورەکان وەڵامی دایەوە گوتی:

کوڕی خۆشەویستم تۆ لێت تێك چووە، وڵاتی عەرەب و ئێرە؟ ئێرە کۆستاریکایە لە وڵاتەکانی "دنیای نوێیە" ئێمە نیازمان خراپ نییە، لێرەدا ئاهەنگی سالآنە لە دەوری ئەم تۆپە دەگێڕین و ئەم ئاهەنگە جۆرە، ناڕەزاییەکە بەرانبەر شەڕو کێشەو داگیرکەرو چەوسێنەرو هەموو جۆرە زۆرو ستەمێك، خۆ ئەگەر لە ئاهەنگەکەمان ترسابن، ئەمەیان خەتای ئێمەی تێدا نییەو پڕ بەدڵ داوای لێبوردنتان لێدەکەین. بەتایبەتی ئێوە بێ هیچ ئاگادارکردنەوەیەك هاتوون و ئێمەتان دۆزیوەتەوە، ئێمە بەمە خۆشحاڵین و پێشنیاز دەکەین ئاهەنگەکەمان حەوت شەوو حەوت رۆژی دی بەردەوام بێ، ئەمەش بەڵگەی یەکێتیی نەتەوەیی و نیشتمانیمانە. ئەوجا هەندێ میوەو گوڵ و خشڵی بە دیاریدانێ، کۆلۆمبس کە چاوی بە خشڵ و زێڕو زیو کەوت شێوازی قسەکردنی گۆڕی، ئالآ سپییەکەی شاردەوەو گوت: ئێوە نەتەوەیەکی کێوی و گومڕان و دوورن لە هەموو دیاردەیەکی شارستانی و ئازادییەوە، بە کورتی تا دنیا دنیایە دەبێ باج و خەراجمان بدەنێ و خۆمان هەندێ کەشیشی شارەزاتان بۆ دادەنێین، ئێوە ئێستا نەتەوەیەکی دۆڕاون و دەبن بە خولآم و خزمەتکاری ئێمە، بە ماڵ و سامانی خۆمان کڕیومانن. کلۆمبس نامەیەکی پڕ لە درۆو دەلەسەی هۆنییەوەو ناردی بۆ وڵاتەکەی خۆی و باسی ئەو شەڕە درۆیەی تێدا کردبوو کە لە نێوان ئەوو خەڵکی ئێرەدا هەڵگیرسابوو. لە کۆتایی نامەکەدا گوتبووی: بێ هیچ مەرجێ خۆیان بە دەستەوەدا، ئەوجا پەردەی لەسەر ئارەزووی خۆی هەڵدابۆوە کە گوایە دەیەوێ خەڵکانی وێندەر بکوژێ تا ناچاریان بکا سەری بۆشۆڕ بکەن. لە کۆتاییدا دەڵێ: "بەمجۆرە بیرم لە دامەزراندنی زیندان و کورسی کارەبایی کردەوە کە سەربازانی هەڵگری نیشانەی قارەمانی پاسەوانی بکەن".

هیدایەت لەو قۆناغەدا بەلای سۆسیالیزمدا دایشکاندووە، لە چیرۆکێکیدا باسی کەسێك دەکا کە خۆی کردووە بە نموونەی بالآترین رەگەزو بڕیاری داوە رژێمێکی نوێ لە جیهاندا دابمەزرێنێ، کێشەکە لە نێوان دوو هۆزدا روودەداو کێشەکە بەوە تەواو دەبێ کە هۆزی دەستە چەپ کاروبار دەگرێتە دەست و هۆزی دەستە راست بە ناچاری مل بۆ شارستانیەت و ئازادی و دادوەری کەچ دەکا، هیدایەت لە چیرۆکی "اب زندگی"دا بیرۆکەی کێشەی دەوڵەتانی دژ بە فاشیزمی بەرجەستە کردووە.

ئەمە گیانی سۆسیالیزمە لە زۆربەی چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەیدا بەدی دەکریٚ لە چیرۆکی: "فردا"دا هێرش دەکاتە سەر ئەوانەی سامان لەسەر حیسابی چەوساوان کۆدەکەنەوە، بە جوانی باسی ژیانی کریٚکارانی ئیٚران دەکا، ئەو کریٚکارانەی بەسکیٚ تیٚرو بە دەسك برسین، پیٚخاوس و لینگ رووت لە سایەی بارودۆخیٚکی سەخت و دژوارا دەژین بیٚ بەشن لە خۆشی و شادی، جڵەوی هیچ شتیٚك لە دەستی خۆیاندا نییە، مهد زانمی یەکیٚکە لە قارەمانەکانی و دەڵیٚ: "پار لە قاوەخانەی گیٚتیدا کارم دەکرد، موشتەرییە قەڵەوەکان بیٚ حیساب پارەیان خەرج دەکرد، ئارەقیان پیٚوە نەڕشتبوو پشتیان پیٚوە نەیەشابوو. هەموو شتیٚکی چاك بۆ ئەوانە: ئۆتۆمبیل، ئافرەتی جوان، خواردنەوەی نایاب، نویٚنی نەرم و گەرم. هۆدەو باڵەخانەی پاك و خاویٚن، ئیٚمەش گەر رۆژیٚ کار نەکەین دەبیٚ بەبیٚ شیو سەر بنیٚینەوە" کریٚکاران نایانەویٚ لە سایەی ئەم بارودۆخە دژوارەدا بژین، مانگرتن و خۆپیشاندان سازدەکەن، بەڵام بە نووکی سەرەنیٚزە بڵاوەیان پیٚدەکریٚ، ترسنۆك و بیٚ باوەڕەکانیش دەترسن و نایانەویٚ ببن بە نیشانەی راوچییان. عباسی کریٚکار وەڵام دەداتەوە: "ئیٚمە هەر دەمرین، تا یەك نەگرین هەر ئەمە حاڵمان دەبیٚ" لە سایەی ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەدا پیٚویستە کریٚکارانی ئیٚران لە پیٚناوی ماف خۆیاندا بجەنگن. نووسەر ئەم جەنگە بە راشکاوی باس دەکاو هەوڵدەدا لایەنە کزەکانی دەست نیشان بکا.

سۆسیالیزمی هیدایەت لایەنی ئینسانی دیکەشی هەیە، تەنیا بایەخی بەکریٚکاران نەداوە، بەڵکو بایەخی بەگشت چین و تویٚژەکانی گەلداوەو خەمە ئینسانییەکانی قۆستۆتەوە. دەستی خویٚنەر دەگریٚ و بە تاکە تاکەی گەلی ئاشنا دەکا، دەیباتە ماڵەکانیان، بەسەر شایی و ئاهەنگەکانیا دەی گیٚڕیٚ، "زن کەمردش را گم کرد"، گۆرانی لەگەڵ مناڵەکانیانا دەڵیٚ: "چنگال" هەندیٚ جار لە شار دوورمان دەخاتەوەو دەستمان دەگریٚ و دەمانباتە خانیٚکەوەو گویٚمان لە دەردە دڵی دوو ریٚبوار دەبیٚ: "محلل".

گشت ئەمانە روجیە لیسکو گوتەنی: "لە گەشتیٚکی جوانی نیٚو ئیٚرانا دەچیٚ". مرۆڤ وا هەست دەکا کە نووسەر بە خۆی لە هەموو ئەو ژینگانەدا ژیاوە.

هیدایەت بە هەموو تواناو دەسەڵاتیٚکی هونەرییەوە هیٚرشی کردۆتە سەر تەعەسوبی مەزهەبی و خواپەرستیی ریاکارانە، لە چیرۆکی "طلب امرزش"دا پەردە لەسەر فەسادی باتنی ئینسان دەڵدەماڵیٚ، ویٚنەی زیارەتکەرانی شویٚنە پیرۆزەکان دەگریٚ کە چۆن گەورەترین تاوانیان کردووەو پاشان دەچنە زیارەتی شویٚنە پیرۆزەکان تا خوا لە گوناحیان خۆش بیٚ! لە یەکیٚك لە ماڵەکانا ژنە قارەمانی چیرۆکی نیٚوبراو بۆ هاوڕیٚکانی دەگیٚڕیٚتەوە کە چۆن بە دزییەوە منداڵەکانی هەویٚکەی خۆی کوشتووەو پاشان هەویٚکەشی کوشتووە. بەمجۆرە کۆتایی بە قسەکانی دیٚنیٚ: "نازانم خوا لە گوناحەکانم خۆش بووە یان نا". تاوانبارەکەی دی مەشهەدی رەمەزانە، ئەویش باسی ئەوە دەکا کە چۆن لە سەفەرا سامانی کابرایەکی ونبووی خستۆتە تەنگەی باخەڵی و چۆن کابرایەکی دی کوشتووەو سەروەت و سامانەکەی بردووە، مەشهەدی رەمەزان دەڵیٚ: "ئیٚستاکە چوومەتە ساڵەوە بیرم کردەوە کە ئەم ماڵە حەرامە بۆیە هاتووم بۆ زیارەتی کەربەلا تا خۆم لە گوناحان پاك بکەمەوە، هەر ئەو رۆژە دەمی ئاخوندیٚکم چەور کردو

دوو هەزار تمەنی پێ حەڵاڵ کردم" بەمجۆرە دوو سەعاتی پێنەچوو تا هەموو ئەم ماڵە لە شیری بەر دایکم حەڵاڵ ترم بوو. بەمجۆرە نووسەر لە نێوان قارەمانانی چیرۆکەکەدا دەسوڕێتەوە، لە تۆ وایە کامیرایەکی بە دەستەوەیەو وێنەی ناخیان دەگرێ، چ شتێك دوور نییە، چ شتێ خەیاڵی نییە، هیچ شتێ دەست کرد نییە.

هیدایەت لە چیرۆکی: "مردی کەنفسش راکشت" وێنەی کەڵکەڵەی سۆفیانەی مامۆستایەکی چینە بۆرژواکە دەگرێ کە بە تاسەوەیە بگاتە کەشکەلانی فەلەك، یەکێك لە دۆستو هاوڕێکانی دەکا بەڕابەرو پیری خۆی، لە ئاکاما ساختەچێتی رابەرو پیرەکەی خۆی بۆ دەردەکەوێو باوەڕی بە رێگاکەی خۆی نامێنێو خۆی دەکوژێ، چیرۆکی: "علویە هانم"ی کە زیاتر شەقڵی خۆماڵی پێوەیە، بە تۆمارێکی گەشو زیندووی خورافاتی ئاینیی باوی ناو ئێران دەژمێردرێ.

بارودۆخی ئافرەتی ئێران پانتاییەکی گرینگی لەبەرهەمی نووسەرە هاوچەرخەکانی ئێران گرتۆتەوە، دیارە هیدایەتیش ئەم لایەنەی فەرامۆش نەکردووە، ئامانجی هەموو ئەو نووسینانەی هیدایەت لەمەڕ ئافرەتی نووسیون بۆ چاك کردنی رژێمی کۆمەڵایەتی تەرخان کراوە، ئەو رژێمەی رێگا بە پیاو دەدا نەك هەر لە رێگای شەرعییەوە بەڵکو لە رێگای سیغەشەوە لە ژنێ زیاتر بێنێ، لە چیرۆکی: "محلل"دا توشی دوو کابرای دەستو ریش خەناوی دەبین لەسەر سەکۆیەك لەبەر ماڵدا دانیشتوونو چا دەخۆنەوە. میرزا یداللە باسی ئەوە دەکا کە چۆن لای ئاخوند دوو ژن بە سیغە دەخوازێو چۆن پاشان هەردووکیان پێکەوە تەلاق دەداو ئەم کچە هەشت ساڵانە دەخوازێ، گلەیی لەبەختی خۆی دەکا کە گوایە لە چاو پیاوانی هەفتا ساڵانەوە منداڵەو ئەوان ژنی لە ژنەکەی ئەم منداڵتریان هەیەو کەس لۆمەیان ناکا.

هەروەها لە چیرۆکی نێوبراودا باسی کیژانی ناشیرینو بێ سامان دەکا کە چۆن بە زەحمەت مێردیان چنگ دەکەوێ، نەزۆکی هۆیەکی کافییە بۆ تەڵاقدانی ژن یا ژن بەسەر هێنانی بە زۆری نەزۆکەکان لە ترس و لەرزدا دەژینو ناچارن بەوەی رازی بن بەسیغە شوو بکەن. لە چیرۆکی:"زن کە مردش را گم کرد" باسی خۆشەویستی یەك لایەنەو ئاکامە خراپەکانی دەکا.

هیدایەت رەخنە لە پەروەردەی رۆژهەلاتی دەگرێو لەگەڵ پەروەردەی ئەوروپاییدا بەراوردی دەکاو لە چیرۆکی "عروسك پشت پردە"دا گاڵتە بە پەروەردەی قارەمانە بێ دەنگە شەرمنەکەی دەکا کە چۆن دەکەوێتە داوی خۆشەویستی بووکە شووشەیەکەوە. قارەمانی چیرۆکی: "شبهای ورامین" هاوار بەسەر ژنەکەیا دەکاو دەڵێ: دەمەوێ بڵێم ئێمە خراپ پەروەردە کراوین، ئەوروپایی بەمنداڵەکەی دەڵێ: ئەم دنیایە هەمووی نیشتمانی خۆتە، پێویستە لە ژیانا سەرکەوتوو تر بێ لە کەسانی دی، پێویستە سەربەرز بی، رێك بە پێچەوانەی ئێمەوە، کە بە منداڵەکانمان دەڵێین: "ئەم دنیایە پردە، ئەو دنیا هەموو شتێکە، ئێمە هەر کە لە کۆشی دایکمان بەر دەبینەوە بۆ ئەو دنیامان دەگرین، توخوا ئەمە ژیانە".

—٥—

چیرۆکەکانی هیدایەت لە هێڵێکی گشتیدا یەکدەگرنەوە ئەویش رەخنەی توندوتیژی ئاوێتە بە داشۆرینە، ئەمە جگە لەو پێچ و پەنایانەی لەرێبازی ریالیزمی رەخنەگرانەی نووسەردا هەیە، دیارە هەموو چیرۆکەکانی بۆ خەوشەکانی کۆمەڵی ئێرانی تەرخان کراون، لە چیرۆکەکانیا تووشی گەلێ قارەمان دەبین کە لە رێگایانەوە پۆخلەوات و خەوشە کۆمەڵایەتییەکان خراونەتە روو، هەندێ لە چیرۆکەکانی دەلالەتی روون و ئاشکرایان پێوەیە، بەڵام ئەمە هەرگیز لە راپۆرتکاری و کرچ و کاڵی هونەرییان نزیك ناکاتەوە، هەندێ لە چیرۆکەکانی بە زمانی یەکەم کەسی قسەکەرەوەیە، لەرووی بیناوە گەلێ سۆزو گودازو هەست و هەڵچوونی جۆراوجۆر دەگرێتەوە، شۆرشێکی سایکۆلۆژی سەخت و دژوار لە چیرۆکە رەشبینەکانیا خۆی دەنوێنێ: ((زندە بگۆر، بوف کور)) ئەم شۆرشە مەترسییەکانی ژیان بەرجەستە دەکاو لایەنە کرێت و ناجۆرەکانی ژیانی مرۆڤایەتی دەخاتە روو.

وەستایی لە چیرۆکەکانی هیدایەتدا پشت بەیەك شێوە دەبەستێ: پوختەی هەڵوێستێك لە هەڵوێستەکانی چیرۆکەکە لەسەرەتادا پاڵ بەخوێنەرەوە دەنێ بۆ ناوەندی رووداوەکە، ئەوجا ئەم رووداوە، رووداوو وەسف و روونکردنەوەی دی لێ دەبێتەوە، پاشان چیرۆکەکە بەشێوەیەکی کوتوپرو چاوەنوارنەکراو بەرەو کۆتایی دەچێ و گرێکە بەجۆرێکی نیمچە مەنتیقی دەکرێتەوە، نموونەی ئەوەش چیرۆکی: ((لالە)) ، ((زنی کە مردش راگم کرد)) و ((چنگال))ە. یەکێتی ئامانج شەقڵی زاڵی تێکرای چیرۆکەکانی هیدایەتن. گشت قارەمانەکانی خزمەتی یەك بیر دەکەن، هەر قارەمانێك لە شوێنی خۆیدا دانراوە، وێرای ئەوەی قارەمان لەلای هیدایەت خەسڵەتی تایبەتی خۆیان هەیە بەڵام بەزۆری دوولایەنن، لایەنێکی بە روخسارو خاسیەتی تایبەتی خودی قارەمانەکەوەیەو لایەنەکەی دیکەی رۆڵی باڵای لە بینای چیرۆکەکەو بەشداری کردن لە رووداوەکانی چیرۆکەکەدا هەیە. هیدایەت کە باسی قارەمانەکانی دەکا، گشت وردو درشت و رواڵەت و رەوشت و خەسڵەتەکانیان رەچاو دەکا، هەموو قارەمانەکانیشی هەر سەلبی نین، بەڵکو قارەمانی ئیجابی ئەوتۆی هەیە کە وەکو تیشك لە تاریکی ژیاندا دەدرەوشێنەوە وەکو: (عباس لە چیرۆکی "فردا"دا، منادی الحق لە چیرۆکی: "حاجی اقا"دا. دوامو الوزارە لە چیرۆکی: "حاجی اقا"دا.

هیدایەت بەدانانی پەراوێز بۆ چیرۆکەکانی، ئیستاتیکایەکی تایبەتیان پێ دەبەخشێت و هەست کردن بە بابەتەکان لە لای خوێنەر قووڵ دەکا. تەبیعەت هەوێنی زۆربەی چیرۆکەکانێن، لە چیرۆکی "لالە"دا سەیر دەکەین خداداد دەکەوێتە دوای عەشقێکی شەهوانی رەبیبەکەی خۆیەوە. رەبیبەکەی هەڵدێ، خداداد دەکەوێتە تاقیب و سۆراخی، تەبیعەت لەبەر چاوی یەکپارچە خەزان و پایزە. کەچی وەختێ بۆ زنجەکەی خۆی دەگەرێتەوە تەنانەت خۆشی بەدەنگی قەلەرەشیشدا دێ. لەچیرۆکی: ((زندە بگور))دا نەك هەر هەست بەخەمگینی قارەمانەکە دەکەین بەڵکو هەست بەخەمگینی تەبیعتەکەی دەوروبەریشی دەکەین. دنیا بارانە، ئاسمان رەشە، لە تۆ وایە بۆتە چوارچێوەو وێنەی ترسناکی خەمی گرتۆتەخۆ، لە چیرۆکی "زنی کە مردش را گم کرد" تەبیعەت نیگەرانە، لە گۆراندایە، رێك وەکو "زرین کلاە"ی رێبواری رێگای

تاران بۆ مازندەران، ویڵی دوای ئەو مێردەیە کە جێی هێشتووە. لە چیرۆکی "گرداب"دا بەفری نێو شەقامەکان و شکە سەرما بە ئازارەکانی ناخی قارەمانی چیرۆکەکەمان ئاشنا دەکا، ئەو قارەمانەی دڵی لە ژنەکەی پیس کردووەو دەری کردووەو بەخۆیشی سەرگەردان و ویڵ کەوتۆتە نێو شەقامەکان.

هیدایەت لە پاڵ بەکارهێنانی تەبیعەتدا، هەندێ رەمزیشی بەکار هێناوە، کاتێ قارەمانی چیرۆکی "شبهای ورامین" دەچێتە ژووری ژنە مردووەکەیەوە. چاوی بە گوڵە وەنەوشەکان دەکەوێ، ئەو گوڵانەی ژنەکەی خۆشی دەویستن. سەیر دەکا ئەوانیش ژاکاون و وشك بوون و هەر کە دەستیان بۆ دەبا لە ژێر پەنجەیدا هەڵدەوەرن، گەڵای دارەکانیش رژاون. ئاوێنە شکاوەکەش لە چیرۆکی "اینە شکستە"دا رەمزو هێمایە بۆ پچڕانی پێوەندی نێوان هەردوو قارەمانەکە.

ئەوەی گەشی و ناسکی بە بەرهەمەکانی هیدایەت دەدا ئەوەیە سەیر دەکەی زۆربەی حیواری قارەمانەکان بە زمانی رەمەکی و عامیانەیە. کەمو زۆر سڵ لە بەکارهێنانی شێوە زمانی ناوچەیی ناکاتەوە، زۆرجار حیوارەکان لە شێوەی شیرازیو مازندەرانیدا بەکاردێن، نووسەر هێند شارەزاو زاڵە بەسەر هەڵسوڕاندنی حیوارەکاندا، کە خوێنەر بە هیچ جۆرێ هەست ناکا ئەم وتانە قسەی باوی سەر زاری خەڵکانی راستەقینە نەبن و زادەی بیرو خەیاڵ بن. بەشێوەیەك رستەکان دەردەبڕێ وەك بڵێی بە تەرازوویەکی تایبەتی کێشانەیان بکا، دەبێ ئەوەش بڵێین هیدایەت زەوقێکی مۆسیقی چاکی هەبوو، بە تایبەتی مۆسیقای چایکوفسکی و سەمفۆنیای شەشەمی، موسیقا دەورێکی گرینگ لە قووڵکردنی بەرهەمی هیدایەتدا دەبینێ وەکو لە چیرۆکی "شبهای ورامین"و "اینە شکستە"دا دیارە، خۆشەویستی دەنگو ئاواز لەلای قارەمانانی زۆربەی چیرۆکەکانیا دووپات دەبێتەوە. هەڵبەتە ئەمەش ئەڵهاو حەزێکی ئێرانییەو رەگوریشەیەکی قووڵی هەیە.

خەسڵەتێکی دی لەبەرهەمی هیدایەتدا دەبینرێ کە لە پەخشانی کۆنی فارسییەوە بۆی ماوەتەوە، ئەویش تێهەڵکێش کردنی شیعرو پەندو قسەی نەستەقە لە نووسینەکانیدا، چیرۆکی "مردی کە خودش را کشت" باشترین بەڵگەی شارەزایی هیدایەتە لە شیعری سۆفیانەی فارسیدا.

## -٦-

هیدایەت لە ئاخرو ئۆخری ساڵی ١٩٥٠دا چووەوە بۆ پاریس، سەفەرەکەی پتر لە نەفی کردنی خودی خۆی دەچوو، بە هیوا بوو لەوێدا -ئەگەر بە موەقەتیش بێ- دەرفەتی کاردکردنی بۆ بڕەخسێ، بەڵام پێ دەچێ لەوێش تووشی گیروگرفت بووبێ. چونکە لە ١٩٥١/٣/١٠ نامەیەکی بۆ براکەی نووسیوەو دەڵێ: "پاش چەرمەسەریەکی زۆر، توانیم بۆ ماوەی دوو مانگ پەساپۆرتەکەم تازە بکەمەوەو مۆڵەتی مانەوەم لە پاریس دەستەبەر بکەم، بەڵام رەنگە بچم بۆ سویسرا یا هەر شوێنێکی دی بێ... ئێرانیان گیروگرفتی زۆریان لەبەردەمە". لە ١٩٥١/٩دا

دەرگای ڤیللاکەی هیدایەت کە لەسەر شەقامی سان میشیل بوو، دەکەنەوەو سەیر دەکەن بە غاز خۆی کوشتووە. لە گۆڕستانی "باوکە لاشیز"دا بە خاك سپێردرا.

هیدایەت بە درێژایی تەمەنی هەستی خۆکوژی لەلا هەبووە لە ساڵی ۱۹۲۸دا کاغەزێکی بۆ براکەی نووسیوەو دەڵێ: "کارێکی شێتانەم کرد، بەڵام باش بوو بە سەلامەتی تێپەڕی". لە ۱۹۲۸/۱۰/۱۵دا نامەیەکی بۆ نووسەری گەورە محەمەد عەلی جەمالزادەی هاوڕێی خۆی نووسیوەو دەڵێ: "بەکورتی هیلاکم، مێشکم تێکچووە، شەوو ڕۆژ بەڕێ دەکەم، دەڵێی حوکمی ئیعدامم بەسەرا دراوە، دەستم لە ئاکامی هەموو شتێك شتووە، ناتوانم جارێکی دی بەتاسەوە روو لە هیچ شتێ بکەم. ناتوانم خۆم هەڵخەڵەتێنم، زاتی ئەوەشم نییە خۆم بکوژم".

زۆر کەس لە هۆی خۆکوشتنەکەی هیدایەت کۆڵیونەتەوە، هەندێ دەی گەڕێننەوە بۆ هەندێ هۆی شەخسی. هەندێ دەڵێن پاش مردنی یەکێك لە دۆستەکانی، لە ژیان وەرس بوو، هەندێکی دیکە هۆی خۆکوشتنەکەی دەگەڕێنەوە بۆ کوژرانی مێردی خوشکەکەی "زرم ارا" لەلایەن "فیداییانی ئیسلام"ەوە. هەندێکی دی دەڵێن خۆ کوشتنەکەی ناڕەزایی دەربڕینێکی عەمەلی بوو بەرانبەر بەر رژێمی رامیاری‌و کۆمەڵایەتی ئێران، چونکە بەر لە خۆ کوشتنەکەی لە زۆربەی بەرهەمەکانیا گەڕابۆوە سەر نائومێدییە کۆنەکەی. لە چیرۆکی "بن بست"دا بەخەستی وێنەی زاڵبوونی قەدەرو لە دەست چوونی هیوای گرتووە. ئەو جەو گشتییەی هیدایەت تێیدا دەژیا. ماندووی دەکرد. بیرکردنەوە لە پیر بوون وەرەسی دەکرد. هەمیشە وای دەبینی کە: "مرۆڤ نابێ لە ٥٠ ساڵ پتر بژی چونکە ژیان لە سەرووی ئەم تەمەنەوە دەبێ بەشتێکی قۆڕە".

هەمیشە دوو هێز لە بوونی هیدایەتدا ململانێیان بووە. ئەو دوو هێزەی کە بناغەی ئایینی کۆنی ئێرانی پێکهاتووەو دەوریان لە ژیانی هەموو ئێرانییەکدا هەبووە، هێزی چاکەو ژیان "ئاهور مەزدا"و هێزی خراپەو نەمان‌و تاریکی "ئەهریمەن" وەختێ یەکێکی وەکو هیدایەت سەیر دەکا ژیان بێهودەیەو "شایانی ئەوە نییە بژیت" دیارە بەرە بەرە لایەنەی روناکی‌و بوون روو لە کزی دەکاو زۆر نابا خوای شەڕ دەستی خۆی دەوەشێنێ‌و لەگەڵ خویدا رای دەماڵێ‌و بەرەو نەمانی دەبا. کێ دەزانێ" لەوەیە هیدایەت خۆی یارمەتی گەشەکردنی ئەو هێزەی دابێ تا زووتر بگاتە کاروانی نەمران. بۆ نا، ئەدی ئەوە نییە فەیلەسووفانی سۆفیزمی فارس دەڵێن: "ئەوی عەشقی لە دڵدا بێ هەرگیز نامرێ" بێگومان ژیانێکی جوان لەودیوە ئەو ژیانەوەیە هەیە کە هیدایەت رەفزی کرد. ئەگەر تقوسە ئاینییەکان نەبان ئەوا هیدایەت باوەڕی قووڵی بە خوا هەبوو. ئەوەتا یەکێك لە قارەمانەکانی چیرۆکی: "شبهای ورامین" دەڵێ: "بەخێرو شەڕ لە مرۆڤدا چ دەخلێکیان بەسەر باوەڕ یا ئایینەوە نییە، هەموو فیت و ئوینەکان لە ژێر سەری ئاخونداندایە. گشت شەڕە ئایینییەکان شەڕی خاچ پەرستەکان لە ژێر سەری کەشیشەکاندا بووە". توانەوە لە خواداو جێهێشتنی ئەم دنیایە لە پێناوی ئەودا یەکێکە لە لوتکەکانی فەیلەسووفانی رێبازی سۆفیزمی فارسی.

هەر چۆنێ بێ هەمیشە خۆ کوشتنەکەی هیدایەت بەوەوە گرێ دەدرێ کە چەشنە ناڕەزاییەك بووە لە بارودۆخی نیشتمان ئێران لە ساڵی خۆ کوشتنەکەی هیدایەتدا لە گێژاوی نائومێدییەکی

تاڵدا دەژیا. ڕۆشنبیران خرانە کونی گۆشەگیرییەوە. پاژنە ئاسنیەکان شەوانە بەر دەرگایان لێ دەگرتن، هیدایەت هەستی کرد لەم بابەتە وڵاتەدا هەرچییەك بنووسێت بێ سوودە. ئەوە بوو چیرۆکی: "تـوپ مروارید"ی نووسی و هێرشێکی توندی تیادا کردە سەر سەرمایەدارانو داگیرکەران، بەڵام کە سەیری کرد بێ سوودە، کاغەزەکانی سووتاندو ڕۆیی.

-٧-

ئەگەر بمانەوێ باسی ئەو نووسینانە بکەین کە لە ئێراندا دەربارەی هیدایەت نووسراونو دەنووسرێن ئەوا باسەکەمان درێژە دەکێشێتو لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نییەو تەنیا مشتێك لەو خەروارە دەخەینەڕوو. د. خانلری دەڵێ: "شیوازی نووسینی هیدایەت بوو بە باوترین شێوازو چ ڕۆمان نووسێکی ئێران نەیدەتوانی ڕۆمانی چڕوپڕی وەکو هی هیدایەت بینا بنێ".

احسان طبري دەڵێ: "لە رووی هونەریو قووڵییەوە کەس بە تۆزی پێیدا ناگا". دیارە گەلێك لە نووسەرانی ئێران کەوتوونەتە ژێر کارتێکردنی نووسینی هیدایەتەوە لێرەدا تەنیا نموونە دێنینەوە بەس. لەوانە: سادق چۆبك، جلال ال احمدو بگرە جمالزادەش کە بەر لەو دەستی داوەتە نووسین، لە کارتێکردنی هیدایەت بەدەر نەبووەو گەلێ لە دەستەواژەکانی هیدایەتی بەگەڵ نووسینو چیرۆکی خۆی خستووەو بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەمان چیرۆکی "ماڵی شێتان"ە.

هیدایەت ئەدەبی فارسی لە کۆشكو بارەگاکانەوە گواستەوە بۆ نێو گەل. لە دنیای سۆفیگەرییەوە گواستییەوە بۆ سۆسیالیزم. لە قارەمانی ئەفسانەییەوە گواستییەوە بۆ قارەمانی ریالیستی، لە جوانکاریو ڕازانەوەی زمانەوە گواستییەوە بۆ قسەی سادەو ئاسایی باوی سەرزاری خەڵكیو هەڵقوڵاوی ویژدانی گەل. بۆیە تاکو لە ژیاندا بوو بە هەزاران چەرمەسەری بەرهەمێکی بڵاودەکردەوە، بەڵام هەر کە مرد ئیدی بەرهەمەکانی لێکدا لێکدا هاتنە بڵاوکردنەوەو ئاهەنگی بۆ سازکرا.

نێوبانگی جیهانیی هیدایەت لەو سەروبەندەدا دەستی پێکرد کە ڕەخنەگرە فەرنساوییەکان کەوتنە بایەخ پێدانی، یەکەمجار ئەوان بەرهەمەکانیان وەرگێڕا، "روجیە لیسکو" "بوف کور"ەکەی وەرگێڕا. "جیلبر لازار""حاجی اقا"کەی وەرگێڕا، بروحیم "فردا"کەی وەرگێڕا، فنسان مونتیە "بن بست"کەی وەرگێڕا. خاتوو رضوي "بوف کور"ەکەی کردە ئینگلیزی. یان ریبکا "مردی کەخودش را کشت، مردە خور، ابجی خانم"ی وەرگێڕانە سەر زمانی چیکی. موریس بوریکی "سگ و لگرد"ەکەی کردە چیکی، هەمان چیرۆك "سگ و لگرد" کرا بە ئەرمەنیش. کمیسرۆفو روزن فیلد کۆمەڵێك بەرهەمیان کردە روسی کە بریتییە لە "٣٠" لاپەڕە.

جگە لەو وتارو لێکۆڵینەوانەی کە: جان کامبوز، فنسان مونتیە، باستور ڤالیری رادو، هنری ماسیە، جان ریچارد بلوك، فیلیب سوبو، رینیە لالو، روجیە لیسکو، ریمبودی سنی، اندریە برتون، جریوزلا بە زمانی فەرەنسی لەمەڕ هیدایەتیان نووسیوەو هەروەها جگە لەو باسەی کمیسروف بە رووسی لەسەری نووسیوە. ئەمانەشی لەسەر نووسراون: ئەندریە رسو لە بەرگی

پێنجەمی کتێبەکە گەورەکەیدا "ئەدەبی سەدەی بیستەم" بەشێکی چاکی بۆ تەرخان کردووە. روجیە لیسکو پێشەکییەکی تێرو تەسەلی بۆ "بوف کور" نووسیوە. فنسان مونتیە کتێبێکی هەیە بەناوی "سادق هیدایەت" خاتوو کشلاو کتێبێکی بە رووسی نووسیوە بە ناوی "پەخشانی هونەری لای سادق هیدایەت" حسان کمشادیش لە ساڵی ١٩٦٦دا نامەیەکی تەقدیمی زانستگای کمبرج کرد بەناوی "پەخشانی هونەری لە ئەدەبیاتی هاوچەرخی فارسی"دا، چەند فەسڵێکی ئەو نامەیەی بۆ هیدایەت تەرخان کردووە. دیارە گەلێ کەسی دیکەش دەربارەیان نووسیوە. ئێمەش لێرەدا ئەم دوو چیرۆکەی وەکو نموونە پێشکەش دەکەین:

١- لالە.

٢- گێژاو.

## "لالە"

لە بەیانی زووەوە گەواڵە هەوران دەهاتن‌و دەچوون، بایەکی ساردی ناخۆشی دەهات. ژێر درەختەکان پڕ بوون لە گەڵای وەریو، گەڵا زەردەکان ناوە ناوە لە درەختەکان دەوەرین‌و بە دەم نەرمە سەماوە دەکەوتنە عاردی. پۆلە قەلەڕەشێك بە قارە قار بەرەو شوێنێکی نادیار دەڕۆیی. خانووی دێهاتەکان لە دوورەوە وەکوو قاوغە شقارتەی لەسەریەك هەڵچنرا، بە پەنجەرەی رەش هەڵگەڕاوو بەبێ دەرگا وا دەهاتنە بەرچاو کە بە موەقەت دروست کرابن.

خوداداد بەڕدێن‌و سمێڵی بۆزەوە، گورج و گوڵ و دڵ وریا هەنگاوی مکومی دەناو هەستی دەکرد هێزو گوڕێکی تازە دەڕژێتە دەمارەکانییەوە. بەڕواڵەت چاوی لە جادە شێدارەکەی نێو پێ دەشتەکەی بەردەمیی بوو. با گەشکەی بە پێستی لەشی دەدا، وای دەهاتە بەرچاو کە درەختەکان دەڕەقسن. قەلە رەشەکان مژدەی شادییان بۆ دەهێناو هەموو تەبیعەت لەبەر چاوی جوان‌و رەنگین‌و روو خۆش بوو. بوخچەیەکی موقەلەمی لەبن هەنگڵی نابوو و بە خۆیەوەی چەسپاندبوو. چاوەکانی دەبریسکانەوە، هەر هەنگاوێکی دەنا، بەلەکە سفتەکانی لە دەلنگی پانتۆڵە رەشە دەڵبەکەیەوە بە دیار دەکەوتن.

جلەکانی شینی ئاسمانی بوو، کڵاوێکی لبادی ئامال زەردی لەسەر بوو.

خداداد پیاوێکی شەست ساڵان بوو. پیاوێکی بە هەیکەل‌و ئێسقان ئەستوور بوو. باڵا بەرزو چاوگەش بوو. کونجی قەناعەتی گرتبوو، و نزیکەی بیست ساڵێك بوو خەڵکی دەماوەند نەیان دیتبوو. خداداد لەلای "کانی عەولا" لەسەر رێگای مازندەران کوخێکی لەبەردو گڵ بۆ خۆ دروست کردبوو. بیست ساڵێك بوو بە تاقی تەنیا دەژیا. بە دەستەش زبرەکانی خۆی زەوی دەکێڵا، ئاوی دەدا، دای دەچاندو درەوی دەکرد. هەمان کار کە باوو باپیرانی دەیان کرد. جێی هەشتا ربە تۆوی بە میرات پێ بڕا بوو کە لە نەهاتە ساڵێکدا نیوەی پتری فرۆشتبوو، نووکە بە بەروبوومی ئەو پارچە زەوییە بچووکەی کە بۆی مابۆوە ژیانێکی خۆشی دەقەتاند.

ئەوەی کەببوە مایەی سەرسامی هەمووان ئەمە بوو کە خداداد لەو ٢-٣ ساڵەی ئەخیردا لە گوندەکان و بە زۆری لە باژێری دەماوەندا دەبینرا کە پارچەی ژنانە، قەندو چاو وردە شتی دەکڕی، زۆر کەسیش لە کێوەکانی دەوروبەری ئاوە گەرم و جابن و گیلیاردا لەگەڵ کچۆڵەیەکی قەرجدا دیتبوویان.

چوار ساڵێك لەوە پێش، لە شەوێکی ساردو تۆفدا، وەختێ خداداد فووی لە چراکەی کردو چووە نێو جێگاوە، گوێی لە دەنگێکی غەریب بوو: ناڵەوفریادی پچڕپچڕ کە مەعلوم نەبوو دەنگی گیاندارە یا ئادەمیزاد. دەنگەکە بەردەوام نزیك دەبووەوە، لە پڕ لە دەرگای کوختەکەی ئەویاندا، خداداد کە نە لە گورگ و نە لە دێو دەترسا، هەستا، دانیشت، هەستی کرد تنۆکە عارەقێکی سارد بە گازەرای پشتیا چۆڕا، هەر چەندە پرسی کێی؟ چت دەوێ؟ چ کەسێك وەڵامی نەدایەوە، کە چووە نێو جێگاو چاوی چووە خەو دووبارە لە دەرگایان دایەوە. بە دەستی لەرزۆك چراکەی هەڵکرد، ئەو سیکارتە زلەی کە بۆ شکاندنی چڵ و چێو بە دیوارەکەیەوە هەڵواسی بوو. هەڵگرت و لە پڕ دەرگاکەی کردەوە. کە دەرگای کردەوەو تەماشای کرد کچۆڵەیەکی قەرەجی سوور پۆش لەبەر دەرگادا وەستاوەو فرمێسك بەسەر گۆناکانییەوە مەییوەو دەلەرزی، هێندەی دی سەرسام بوو، خداداد سیکارتەکەی توردایە سوچێکی ژوورەکە. دەستی کچۆڵەکەی گرت و بردییە ژوورەوە. هالاوی ئاگرەکە کچۆڵەکەی گەرم کردەوە. پاشان خداداد بە جلە کۆنەکەی خۆی جێگایەکی بۆ دروست کرد.

سبەی بەیانی هەر پرسیارێکی لێکرد، بێ ئەنجام بوو، دەتگوت کچۆڵەکە سوێندی خواردووە چ شتێك دەربارەی خۆی نەڵێ و نەدرکێنێ، بۆیە خداداد ناوی لاڵ یا لالۆی لێ ناو بەرە بەرە ئەم ناوە بوو بە لالە. ئەوەی غەریب بوو ئەوەبوو کە وەختەکە وەختی گەرمیان و کوێستانی قەرەجان نەبوو، خداداد نەیدەزانی ئەم کچۆڵەیە لە کوێوە هاتبوو. لە کوختەکەی وەدەرکەوت و شوێن پێی کچۆڵەکەی هەڵگرت، بەڵام شوێن پێیەکانی لەسەر گەڵاوەریوەکان ون دەبوو، لە ئاشەوانەکەی کانی عەلای پرسی، ئەویش هیچی لێ نەدەزانی. ئەنجام بڕیاریدا کچۆڵەکە لای خۆی ڕاگرێ و ئاگاداری بکا تا کەس و کارو خاوەنی پەیدا دەبن.

لالە کچۆڵەیەکی ١٠-١٢ ساڵەی گەنم ڕەنگ بوو. دەمو چاوی ناسك و چاوەکانی گەش و لەبەر دڵان بوو. خاڵیان لەسەر دەست و تەختی هەنیەی کوتابوو. لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا کە لە کن خداداد مایەوە، خداداد هەر چەند پرسیاری کەسوکاری ئەوی کرد، هیچ یەکێك لە قەرەجەکان نەیان ناسی، خدادادیش وای لێهات حەزی نەدەکرد لالە لە دەست بدا! وەکو ڕۆڵەیەکی خۆی گلی دایەوەو بەرەبەرە خۆشەویستییەکی تایبەتی دەرهەق بەو لەلا دروست بوو، نەك خۆشەویستی باوك و جگەرگۆشە، بەڵکو خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد.

هەر کە وەسوەسەی ئەشق لە کەللەیدا، پەردەیەکی کرد بەناو بڕەی ژوورەکە تا شوێنی نووستنیان لێکدی جودا بێ. ئەوەی لە هەموو شت خراتر بوو ئەوەبوو لالە بە خدادادی دەگوت بابەو هەر جارێ بە بابە گازی کردبا ئێدی حاڵی خراپ دەبوو. ڕۆژێك خداداد گەڕایەوە ماڵێ سەیری کرد دوو مریشکی سەر بە کلاو لەبەردەم کوختەکەیدا چینە دەکەن.

هـەر چـەندی خـداداد ئامۆژگـاری لالـەی دەکـرد کـە دژی کـارێکی درێـوەو لـە ئـاگری دۆزەخـدا دەسووتێی، بزەیەکی لاسارانە دەکەوتنە سەر لێوی‌و هەر جارەی بە هەنجەتێك خۆی لـەم چەشـنە گفتوگۆیە دەرباز دەکرد.

لالە زۆری کەیف بە گەشت‌و گەڕان دەهات، خۆ ئەگەر ٢-٣ رۆژێك باران بووایەو بە ناچاری لـە کوختەکەدا ماباوە ئیدی پەست‌و غەمگین دەبوو، بەڵام لە رۆژانی خۆشدا یا لەگەڵ خداداد یا بـە تەنێ دەچووە گەشت‌و گەڕان. زۆربەی کات بە تەنێ دەڕۆیی‌و هەر ئەمەش گومانی لـەلای خداداد چێ دەکرد، چونکە ٢-٣ جاران عەباسی شوانی لەگەڵ لالەدا دیتبوو و عەباسی بە رەقیبی خۆی دەزانی. تەنانەت رۆژێك دیتبوی کە عەباس توترکی دەچنی و دەی کردە دەمی لالـەوە، هـەر ئـەو شەوە کەوتە سەر کۆنەکردنی لالە کە نابێ لەگەڵ پیاوی غەریبەدا قسان بکا، فرمێسك لـە چاوانی لالە قەتیس مان‌و دڵی دێهاتیانەی خداداد پڕ بوو. دایکی عەباس دوو جاران هـاتبووە خـوازبێنی لالـە بـۆ کوڕەکـەی، بـەڵام خـداداد جـوابی دابـۆوە کـە لالـە هێشـتا منداڵـە. لەبـەر خۆیـەوە وای بیر دەکردەوە کە ئەم عەباسە تەمەڵ‌و تەوەزەلە دەبێ بە میراتگری ئـەو و هەرچـی سـەروەت‌و سـامانێك کـە لـە مـاوەی پـەنجا سـاڵدا پێکـەوەی نـاوە دەبـێ بـەهی ئـەو. ئـەوجا رۆحـی باووباپیرانی چ بـەو دەڵێن! لەبری میراتگر، زەلامێکی بێ سەروبەری هەڵبژاردووە کە نـاتوانێ زەوییەکـە خزمـەت بکـاو دایچێنێ. جگـە لەمـەش کچێك کـە بـە خـۆی داڵـدەی داوە، خـواردنی داوەتـێ، جلـی بـۆ کڕیـوە، زەحمەتی پێوە کێشاوەو گـەورەی کـردووە، عـەینی وەکـو درەختێکـی میـوەی دەهاتـە بەرچاو کە خـۆی پـەروەردەی کردبـێ و هێنابێتـە بـەرو زەلامێکـی بێگانـەی حـەوتا میللـەتی بەرەکـەی بچـنێ، چما ناتوانێ لالە بۆ خۆی بخوازێ" بۆ نەء؟ بەڵام هەسـتی دەکـرد مەسـەلەکە بـەم سادەییە نییـەو رەزامەندی کچەکەش مەرجە، ئەمە جگە لەوەی هەرچەند کچەکە بە بابەی گاز دەکـرد هێنـدەی دی نائومێـد دەبـوو، زۆرجـار کـە شـەوان کچـەکە خـەوی لـێ دەکـەوت خـداداد چـراکەی هەڵـدەبڕی، قـەیرێکی تـەواو بـە دیارییـەوە دەوەسـتاو سـەیری دەموچـاو، سینە، مـەمك‌و بازووەکـانی دەکـرد، پاشان وەکـو شـێت وەدەردەکـەوت‌و دەیدایـە کێـوو بەنـدەنان‌و زۆر درەنـگ دەگەڕایـەوە، ژیـانی لـە نێـوان تـرس وهیـوادا دەهـات‌و دەچـوو، تـرس رێـی نـەدەدا ئەشـقی خـۆی بـۆ دەربـڕێ. ئەگـەر لالـە بیگوتبایـە: "نـەء تـۆ پیری" ئیـدی ئـەو چ چـارێکی نـەدەما جگـە لـە خۆکوشـتن، تـاوێرە بـەردێکی گەورە لە نزیکی کوختەکـەی خداداد بـوو، لالـە بـە زۆری لەسـەر ئـەو تـاوێرە رۆدەنیشـت‌و بەلەکـە سفت‌و سۆڵە رووتەکانی لێکدی دەچەسپاندو بە سەعاتان بەو دەقەوە دەمایەوەو جـار جـارە لـەبن لێوانـەوە سـترانێکی غـەمگینی دەگوتـەوە. بـەڵام هـەر کـە یـەکێکی نزیـك دەبـۆوە لـە پـڕ کـڕ دەبـوو. خداداد بەڕێکەوت ئەم سترانەی لێ ژنەوتبوو زۆری حەز دەکرد جارێکی دیکەش گوێی لێ بێ.

ئـەوڕۆ سـبیانێ وەخـتێ خـداداد دەیوسـت بچـێتە شـاری دەماوەنـد، لالـە لەسـەر هـەمان تـاوێر رۆنیشتبوو، بەڵام لە هەموو رۆژێك شادو بەدەماخ تر بوو، بە پێچەوانەی جارانـەوە نەیوسـت دوی خداداد بکەوێ‌و بچێ بۆ شارێ، خداداد پێی گوت: "لەچکێکی سوورت بۆ دەکڕم".

بـزە منداڵانـەو بێگەردەکـەی ئۆخـەی خسـتە دڵ‌و دەروونـی خـدادادەوە، هـەر کـە گەییـە بـازاڕە چکۆڵەکەی دەماوەند بەر لە هەموو شتێك خۆی بە دوکـانێکی بـەزازی داکـردو لەچکێکـی سووری

گوڵ کەسكو زەردی کڕی. پاشان قەندو چای کڕی، هەر هەمووی لە بوخچە موقەلەمەکەی ناو بەپەلە بەرەو کوختەکەی خۆی کەوتەڕێ.
بۆ خداداد کە قاڵبووی ڕێگاوبان بوو، هەر چەندە نێوان شارو کوختەکەی دوو قۆناغە ڕێیان دەبوو، هەر بە ئەندازەی هەڵەتێك دەهاتە بەرچاو، هەر چەندە پیرو کەنەفت ببوو، بەڵام نووکە ژیان جۆرە مانایەکی تێ کەوتبوو، بە دەم ڕێوەو لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە.
"ئەم لەچکە هەر بۆ وەی جوانە لالە بەشانیا بداتو لچکەکانی لە ژێر مەمکەکانییەوە گرێ بدات" پاشان وەك ئەوەی شەرمی بەخۆبێ، بە خۆی دەگوت: "دەبێ شانازی بە جوانی ئەوەوە بکەم، چونکە من لەبری بابی ویمەو دەبێ مێردێکی چاکی بۆ پەیدا بکەم" بەڵام هەر چەندە عەباسی شوانی بیر دەکەوتەوە کە لالەی خۆش دەوێ، خوێنی دەهاتە کوڵ.
بە هەورازو نشێواندا، بە قەراغ چۆمو دۆڵانداو بە قەدپاڵو هەڵەتاندا تێدەپەڕی. لە ڕێگادا کەسی نەدەدی، هەستی بە چ شتێك نەدەکرد. تەنانەت ماندووبوونی ڕێگاش کاری لێنەدەکرد. زۆربەی کات وەختێ ڕێی دەکەوتە گوندەکانی دەوروبەر. دەیڕوانییە ئاسمان تا بزانێ باران دەبارێ یان نا. دەیڕوانییە زەوییەکان تا چاو با حاسڵاتی خەڵکیدا بگێڕێ، پرسیاری نرخی جۆ، گەنم، لۆبیا، قەیسی، سێو، گێلاس، زەردەلو و شتی دی دەکرد، بەڵام نووکە هەموو هۆشو گۆشی لە کن لالە بوو، بەروبوومی ئەو ساڵی زەوییەکەی چاك نەبوو، بۆیە ناچار بوو هەندێك لە پاشەکەوتەکەی خۆی خەرج بکا، بەڵام هەر هەموو ئەمە بەلای ئەوەوە تاڵێك لە قژی لالەی نەدەهێنا.... بەدەم ئەو بیرانەوە بەکەنار درەختەکاندا ڕەت بوو، چووە سەر ئەو جادەیەی کە کوختەکەی ئەو کەوتبووە سەر زورگەکەی بەرانبەری، کوختەکەی لەدوورەوە دەتگوت دوو قاوغە شقارەتی شکاوی پێکەوە چەسپێنراوە، پێی هەڵگرت. پتر بوخچەکەی گوشییە خۆیەوە، بە پەلە ڕێگای دەبڕی، لە هەورازێکی دی ڕەت بوو، پێچێکی کردەوەو لەبەردەم کوختەکەی خۆیەوە سەری دەرهێنا، بەڵام لالە لەوێندەر نەبوو، نە لەسەر تاوێرەکە بوو نە لە ژوورەوە.
هاتە بەر دەرگا، دەستی خستە کەنار دەوی، هاواری کرد: "لالە... لالە....!" کەس وەڵامی نەدایەوە. چووە دەرێو بە هەموو هێزێکی خۆیەوە گازی کرد: "لالە... لالو... لالو..".
بانگەکەی دەنگی دەدایەوە: "لالە... لالو..." ترسو واهیمەیەکی سامناکی لێ نیشت غاری دایە سەر تاوێرەکە، ڕوانییە بەردەم کوختەکەیو هەموو ئەو دەوروبەرە. چ ئاسەوارێکی جل سووری نەدی، گەڕایەوە وەژوور کەوت، سەندوقەکەی لالەی کردەوە، سەیری کرد ئەو جلە تازانەی کە ئەمساڵ بۆی کڕی بوو نەمابوون. خەریك بوو دین ببێ، سەری لەو مەسەلەیە دەرنەدەکرد، دیسان وەدەرکەوت، لەسەر کانی عەلا تووشی ئاخوندی گوندی بوو، کڵاوێکی شرۆڵەی لەسەر بوو، بە پانتۆڵێکی ڕەشو کەوایەکی سێ چاکییەوە لەبن درەختێکدا دانیشتبوو و سەبیلی دەکێشا، هێند بەرقەوە ڕوانییە خداداد کە زاتی نەکرد چ پرسیارێکی لێ بکا، کەمێك لەولاترەوە ژنێکی چارشێو سووری بێجامە ڕەشی پرچ هۆنراوەی بینی کە منداڵەکەی لە کۆڵ کردبوو.
ئەویش چ هەواڵێکی لالەی پێ نەبوو، خداداد بە ناچاری زڤرییەوە.

تاریکی شەو هەموو لایەکی گرتەوە، لالە نەهاتەوە، خداداد چ خەون گەلێکی ناخۆشی دی! نا. هەر خەو نەچووە چاوی، کابوس بوو. لەگەڵ بچووکترین دەنگا رادەبوو، بە خەیاڵی خۆی لالە هاتۆتەوە، زیاد لە دە جاران هەستا، پەردەکەی لادەدا، بەلەپە کوتیێ جێگا ساردەکەی لالەی سەح دەکردەوە، دەلەرزی‌و دەکەوت. ئایا بە تۆبزی رەدوویان خستووە" ئایا هەڵیان خەڵەتاندووە یا بەخۆی رۆییوە؟.

سبەی بەیانی دنیا ساف و سارد بوو، خداداد لەچکە سوورەکەی لەگەڵ خۆدا هەڵگرت‌و چووە سۆراخ‌و تاقیبی لالە، لە رێگادا هەموو خەڵکی چەشنی دێوو ئەژدیها دەهاتنە بەرچاوی، کێوانی شین باوو بۆر کە بەفر تا نیوەیان هاتبوو ترسیان دەخستە دڵییەوە، بۆنی پۆنگەی کەناری جۆگایەك هەناسەی سوار دەکرد، لە رێگادا تووشی دوو کەسی دێهاتی بوو، بە شپرزەییەوە لێی پرسین: "ئەریێ لالەتان نەدیتووە؟".

هەوەڵجار وایانزانی دین بووە، لێیان پرسی: "کێ؟".

"کچە قەرەجێك"

یەکێکیان گوتی: "دوو رۆژە تاقمە قەرەجێك هاتوون‌و لە موجحدا هەڵیان داوەو دیارە مەبەستت وانە" خداداد ملی رێگای موجحی گرت، ئەمجارەیان بە هەنگاوی هەڕاوو خێراوە نزیك بۆوە سەیری کرد شینە زەلامێك لە کەنار جۆکەیەکدا خەوتبوو. تۆزێ لەو لاترەوە ژنە قەرەجێك ساواری لە بێژنگ دەدا. ژنەکە سڵاوی کردو گوتی: "فاڵ دەگرینەوە، میوە مارانەمان هەیە، هێڵەك، بێژنگ، گوێزو...".

خداداد شێت ئاسا گوتی: "لالە، لالو-ت نەدیتوە، نازانی لە کوێندەرە؟"

"فاڵ دەگرینەوە، پێت دەڵێین"

"دەی بڵێ، پارەکەت دەدەم"

"هەقەکەی بدە تا پێت بڵێم"

خداداد شەکەت بوو، دەستی بە بەرکیا کرد، قرانێکی دەرهێناو دایە ژنە قەرەجەکە، ژنەکە دەستی گرت، روانییە دەموچاوی‌و گوتی: "عەلی پشت‌و پەناتە. کابرا تۆ خەمێکت لە دڵدایە. چوننکە شتێکت لیێ گوم بووە کە چوار ساڵی رەبەق زەحمەتت پێوە کێشاوە. نە جگەر گۆشەتەو نە لە جگەر گۆشەی خۆت کەمترت خۆش دەویێ".

خداداد بە چاوانی فرمێسکاوییەوە دەی روانییە ژنە قەرەجەکە. لەبن لێوانەوە گوتی: "راستە، راستە".

"بەڵام، بە خۆڕایی خۆت خەفەتخان مەکە، چونکە ئەو کیژە لێتەوە نزیکەو لەم ناوەیە. ساغ‌و سەلامەتە. ئەویش تۆی خۆش گەرەکە. بەڵام بە چ دەچیێ.چارەنووس کاری خۆی کردووە!"

"چۆن چۆن؟ تو خوایەکەت قسان بکە"

"خۆت خەفەتخان مەکە. ئەو بەختەوەرە. دەرکی ژوورەکەت بە بەتاکی جێهێشتووەو شەیتان وەژوور کەوتووەو هەڵی خەڵەتاندووە".

"نێوی عەباس نییە؟".

"نەء"

"تۆ كێی چۆن دەزانی؟ توبی ئەو خوایە راستییەكەم پیٚ بڵیٚ، چیت بویٚ ویٚت دەدەم".

دەستی بە بەڕكیا كردو قرانێكی دی دەرهێناو نایە مستی قەرەجەكە، بەڵام لەم كاتەدا سەیری كرد پەردەی رەشماڵەكەی تەنیشتەوە لادراو لالە وەدەركەوت. هەمان ئەو جلكە سوورە تازەیەی كە بۆی كڕی بوو، لە بەریا بوو، سێوە لاسوورەیەكی بەدەستەوە بوو، بەسەری قوڵی كراسەكەی دەی سڕی و قەپی لیٚ دەدا، ئەوجا بە نەرمە پێكەنینەوە رووی كردە ژنە فاڵچییەكەو گوتی: "دایكە ئەمە بابە خدادادە."و بەدەست ئیشارەتی بۆ لای ئەو كرد.

خداداد لە سەرسامیدا دەمی داچەقی بوو. لێكدا لێكدا دەیڕوانییە لالەو دایكی، تا نووكە لالەی بەو شادی و بەدەماخییەوە نەدیتبوو، دەستی بە بوخچەكەی داكرد، لەچكە سوورەكەی دەرهێناو لەبەردەمی لالەدا دایناو گوتی: "كە چوومە شار ئەمەم بۆ تۆ كڕی".

لالو بە دەنگی بەرز پێكەنی، لەچكەكەی دا بە شانیاو، لە ژێر مەمكەكانیەوە گرێیدا. ئەوجا بە غار خۆی گەیاندە بەر رەشماڵەكە، دەستی پیاوێكی گەنجی گرت‌و رای كێشایە دەریٚ، ئاماژەی بۆ لای خداداد كردو شتێكی بەو پیاوە گوت. پاشان بە هەمان شێوەی تایبەتی خۆی لەبن لێوانەوە كەوتە گۆرانی‌و بە پوزە سفت‌و سۆڵەكانیەوە دەستی كردە گەردنی ئەو پیاوەو بەبن دار بییەكاندا رەت بوون‌و دوور كەوتنەوە.

خداداد لە خەفەت‌و شادیدا دەگریا، بە لەقە لەق بە هەمان ڕێی خۆیدا گەڕایەوە، خۆی بە كوختەكەیدا كرد، دەركەكەی لەسەر خۆی داخست‌و ئیدی چ كەسێك نەیدی.

## "گێژاو"

هەمایون لەبن لێوانەوە بە خۆی دەگوت:

"ئایا راستە؟... دەشێت؟ بەو لاوییە، لەوێدا لە شا عبدالعظیمدا لە نێوان هەزاران مردووی دیكەدا، لە ژێر خاكی ساردو شێدارا خەوت بیٚ... كفن لە بەدەنی چەسپی بیٚ! ئیدی نە هەوەڵی بەهار دەبینیٚ‌و نە ئاخیری پایزو نە رۆژانی كپ‌و خەمگینی وەكو ئەمڕۆ.. ئایا رۆشنایی چاوەكانی‌و ئاوازی دەنگی بەیەكجاری دامركانەوە!.... ئەوی كە هەمیشە دەم بە پێكەنین‌و قسە قوت‌و زار شیرین بوو..."

دنیا هەور بوو، تەنكە بوخارێك نیشتبووە سەر شووشەی پەنجەرەكەو لە پشت تەنكە بوخارەكەوە سەربانە جەمەلۆنییەكەی ماڵە هاوسێكە دیار بوو كە تەنكە بەفرێكی نیشتبووە سەر. كڵۆ بەفرەكان بەردەوامو بە ئەسپایی دەهاتنە خواریٚ‌و دەكەوتنە سەر گوێسەبانەی سەربانە جەمەلۆنییەكە. دوكەڵێكی رەش لە دووكەڵ كێشی سەربانەكەوە دەهاتە دەریٚ‌و لە ئاسمانی لێڵ‌و تاریكدا لوولی دەخواردو بەرە بەرە ون دەبوو.

هەمایون و ژنە جەحێڵەکەی‌و هومای کچۆڵەیان لە ژوورەوەو لەبەر سۆپا دانیشتبوون، بەڵام بە پێچەوانەی جارانەوە کە ڕۆژانی هەینی پێکەنین‌و شادی لەم ژوورە دەباری، ئەو ڕۆژە کە هەموویان خەمبارو مات‌و بێدەنگ بوون، تەنانەت کیژە بچووکەکەشیان کە هەمیشە مایەی شادی‌و گەرمی ماڵەکە بوو. ئەوڕۆ بووکە گەنجینە سەروچاو شکاوەکەی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو، مات‌و بێدەنگ دەیڕوانییە دەرێ دەتگوت ئەویش پەی بەوە بردبوو لە شتێکیان کەمەو ئەویش مامە بارام گیان بوو کە وەکو جاری جاران نەهاتبوو، هەروەها هەستی دەکرد کە خەمباری‌و لێو بەباری باب‌و داکی سەبارەت بەوە: جلی ڕەش، چاوانی سوور هەڵگەڕاوی بێ خەو، دووکەڵی لە هەوادا لوول خواردووی جگەرە، هەموو بەڵگەی دروستی بیرکردنەوەکەی ئەو بوون.

هەمایون چاوی بڕی بووە ئاگری سۆپاکە، بەڵام بیری لە شوێنێکی دیکە بوو، بێ ئیختیار کەوتبووە یادی ڕۆژانی قوتابخانە، ئەو سەروبەندەی کە وەکو ئەوڕۆکە بستێك بەفر دەکەوت، کاتی زەنگی پشودان لێی دەدا ئەوو بارام بەر لە هەمووان، دەهاتنە دەرێ گەمەی ئەو دەمانەیان هەمیشە یەك جۆر بوو: تۆپەڵە بەفرێکیان بەسەر ئەرزەکەدا گل دەکردەوە تا دەبوو بە تۆپەڵێکی گەورە، ئەوجا منداڵەکان دەبوون بە دوو دەستە، تۆپەڵە بەفرە گەورەکەیان دەکرد بە سەنگەرو ئیدی شەڕە تۆپەڵ دەستی پێدەکرد. بێ ئەوەی هەست بە سەرما بکەن بە دەستی ڕچیوی سوور هەڵگەڕاوەوە تۆپەڵە بەفریان دەهاویشتە یەکدی، ڕۆژێ کە لە گەرمەی ئەو یارییەدا بوون، ئەو چنگێ بەفری ئاوداری هەڵگرت‌و لە نێو دەستیا گوشی‌و سرەواندیە بارام‌و هەنیەی بریندار کرد، بەرێوەبەر هات‌و حەیزەرانێکی قایمی بە نێو لەپی ئەودا کێشا، ڕەنگە سەرەتای دۆستایەتی ئەوو بارام بگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمە، تا ئەم ئاخرو ئۆخرەش هەر جارێ کە چاوی بە شوێن زامەکەی سەر هەنیەی ئەو دەکەوت، ئازاری حەیزەرانەکەی بیر دەکەوتەوە. لە ماوەی ئەم هەژدە ساڵەدا هێند روح‌و فیکریان لێك نزیك ببۆوە نەك هەر تەنیا بیرو هەستی زۆر نهێنی خۆیان لای یەکدی دەدرکاند، بەڵکو زۆر بیروبۆچوونی نهێنی یەکدییان بێ چ قسە کردنێك دەخوێندەوە. بیرو سەلیقەو ڕەوشتیان زۆر لێکدییەوە نزیك بوو. تا نووکە کەمترین ناکۆکی یا دردۆنگیان نەکەوتبووە نێوان، تاکو پێرێ بەیانی کە هەمایون لە دایەرە بوو تەلەفۆنیان بۆ کرد کە بارامی میرزا خۆی کوشتووە. هەمایون دەست بەجێ گالیسکەیەکی گرت‌و بە تاو خۆی گەیاندە وێندەر، بە ئەسپایی ئەو پارچە سپییە خوێن مژیوەی سەر دەموچاوی لابرد، برژانگی خوێناوی، مێشکی پرژاوی سەر سەرینەکە، پەڵە خوێنی سەر قالیچەکە. شین‌و شەپۆری خزمەکانی چەشنی هەورە تریشقە کاریان تێکرد، ئەوجا تا بولێلی ئێوارێ بە خاکیان سپارد بەدیار جەنازەکەوە مایەوە، ناردی چەپکێ گوڵیان هێنا، خستییە سەر گۆڕەکەی ئەوو پاش دوا ماڵاوایی بەدڵی پڕەوە بۆ ماڵ گەڕایەوە، بەڵام لەو ڕۆژەوە تا نووکە ئۆقرەی لەبەر بڕابوو. خەو نەچووبووە چاوانی‌و لاجانگەکانی داوی سپیان تێکەوتبوو، پاکەتێك جگەرەی لەبەر دەمدا بوو و لێکدا لێکدا جگەرەی لێ دەکێشا.

یەکەمین جاربوو کە هەمایون بە قووڵی بیری لە مەرگ دەکردەوە، بەڵام بیری بە هیچ کوێدا نەدەگەیی، چ بیروباوەڕێك قەناعەتی پێ نەدەهێنا.
تەواو کاس و مەنگ ببوو، نەیدەزانی تەگبیری چییە، هەندێ جار تووشی حاڵەتێکی شێتی دەبوو، هەرچییەکی دەکردو دەکۆشا نەیدەتوانی فەرامۆشی بکا، دۆستایەتیان لە قوتابخانەوە دەستی پێکردبوو، ژیانیان تا رادەیەکی زۆر ئاوێتەی یەکدی ببوو. ببوون بە شەریکی غەم و شادی یەکدی، هەر کاتێ دەگەڕایەوەو تەماشای وێنەکەی بارامی دەکرد، هەموو یادگارەکانی لەلا زیندوو دەبوونەوەو ئەوی دەبینی: سمێڵە زەردەکەی، چاوە رەش و لێك بڵاوەکانی، دەمە چکۆڵەکەی، چەناگەی باریکی، قاقای پێکەنینەکەی لەبەر چاوی بوون، باوەڕی نەدەکرد کە مردبێ، مردنێك بەو ناگەهانییە....! بارام چ زەحمەتێکی بۆ ئەو نەکێشابوو، لە ماوەی ئەو سێ ساڵەدا بە ماموریەت رۆیی بوو و بارام سەرپەرشتی ماڵەکەی بۆ دەکرد، وەکو بەدری ژنی دەیگێڕێتەوە "نەیهێشت عەزرەت لە دڵیان بمێنێ".
هەمایون نووکە هەستی بەبار قورسی ژیان دەکردو داخی بۆ رۆژانی رابوردوو دەخوارد کە چۆن یەکماڵی لەم ژوورەدا لە دەوری یەکدی خڕ دەبوونەوە. یاری نەردیان دەکردو چەندین سەعاتیان بە شادییەوە دەقەتاند بێ وەی هەست بە تێپەڕبوونی کاتەکە بکەن.
بەڵام ئەوەی لە هەموو شتێك پتر ئازاری دەدا ئەم بیرە بوو: "وێڕای ئەوەی ئەوەندە هۆگری یەکدی بوون و چ شتێکیان لە یەکدی نەدەشاردەوە، چۆن بوو بارام ئەوی لەم بڕیاری خۆکوژییە ئاگادار نەکردەوە؟ عیللەتی چی بوو؟ شێت ببوو یا نهێنییەکی خانەوادەیی لە ئارادابووە؟ لێکدا لێکدا ئەو پرسیارەی لە خۆ دەکرد. ئەنجام وەك بڵێی بیری لەسەر شتێك گیرسایەوە پەنای بردە بەر بەدری ژنی و لێی پرسی:
"تۆ چ مەزندەیەك دەکەی نازانم بارام بۆ ئەم کارەی کرد؟".
بەدری کە بە رواڵەت خەریکی درومان بوو و بەسەر دەرزی و تەقەڵادان نوشتابۆوە، سەری هەڵبڕی و وەکو ئەوەی چاوەنۆڕی ئەم پرسیارە نەبووبێ بەبێ مەیلییەوە گوتی:
"من چ بزانم، چی بە تۆ نەگوتبوو؟"
"نەء... بۆیە پرسیارم کرد... منیش لەمە سەرسامم... وەختێ لە سەفەرەکەم گەڕامەوە هەستم کرد گۆڕاوە، بەڵام هیچی بە من نەگوت، پێم وابوو لە کاروباری دایەرە وەڕزە... چونکە کاری دایەرە رۆحی دەژاکاند. چەندین جار ئەمەی لای درکاندبووم... بەڵام خۆ ئەو چ شتێکی لەمن نەدەشاردەوە."
"خوا عافوی بکا! چەند زیتەڵ و بە دەماخ و قسە خۆش و سوعبەت چی بوو.... ئەم کارە لەو نەدەوەشایەوە".
" نەء، بە رواڵەت وای دەنواند: هەندێ جار زۆر دەگۆڕا. زۆر.... بە تایبەتی ئەو کاتانەی بە تەنێ بووایە... رۆژێ خۆم بە ژوورەکەیدا کرد نەم ناسییەوە. سەری خستبووە نێو هەردوو دەستی و بیری دەکردەوە هەر کە چاوی بە من کەوت راچڵەکی، بۆ وەی شتەکە لە من وەشێرێ پێکەنی و دەستی بە هەمان شۆخیان کرد. تەمسیلی چاکی دەکرد!".

"رەنگە شتێکی بووبێ‌و دڵی نەهاتبێ بە تۆی بڵێ‌و ملاحەزەی کردبی نەبا پێی غەمگین ببی. ئاخر هەرچییەك بێ تۆ ژن‌و منداڵت هەن، دەبێ لە بیری ژیاندا بی. بەڵام ئەو...."

بە مەعناوە سەری لەقاند. وەك ئەوەی خۆ کوژی ئەو چ بایەخێکی نەبێ، بێدەنگ باڵی بەسەرداکێشانەوە. بەڵام هەمایون هەستی کرد قسەکانی ژنەکەی ساختەن، هەمان ژن کە هەشت ساڵ لەمەوبەر دەی پەرست، چونکە بیری یەکجار ناسکی سەبارەت بە عەشق هەبوو! بەڵام لەم ساتەدا وەکو ئەوەی پەردەیەك لەبەرچاوی لاچووبێ، ئەم خەم ساردییەی ژنەکەی بەرانبەر بەیادگارەکانی بارام بێزاری کرد. لە ژنەکەی بێزار بوو چونکە نووکە ببوو بە پولەکی و هەموو هۆش و گوشی لەلای ژیان و ماڵی دنیا بوو و نەیدەویست رێ بەخەم و خەفەت بدا. هەموو بەڵگەشی ئەمە بوو کە بارام ژن و منداڵی نەبوون! چ بیرێکی قیزەوەرە، چونکە ئەو خۆی لەم لەزەتە گشتییە مەحروم کردووە، مردنەکەشی جێی داخ نییە، ئایا بایەخی منداڵەکەی ئەو لە هاوڕێکەی زیاترە؟ هەرگیز! ئایا بارام شایانی داخ نەبوو؟ ئایا لە دنیادا کەسی وەکو ئەو دەبێتەوە؟....

ئەو بمرێ‌و ئەم سەید خانمە خەڵەفاوە نەوەد ساڵەیە، کە ئەوڕۆکە بە نێو بەفرو سەرمادا لە پاچنارەوە بە دارەتەقێ هاتبووو سۆراخی ماڵی بارامی دەکرد تا بڕوا حەلوای مردووان بخوا. بژی. ئەمە کاری خوایە لە روانینی ژنەکەیەوە ئاساییەو بەدری ژنی ئەویش رۆژێك دێ وەکو ئەم سەید خانمە دەردەچێ، هەر لە ئێستاوە بێ میکیاج زۆر گۆڕاوە. چاوەکانی‌و دەنگی گۆڕاون. کە بەیانی زوو ئەم دەچێ بۆ دایەرە ئەو هێشتا لەغورابی خەودایە، ژێر چاوانی چرچ بوون‌و ناسکی جارانیان نەماوە، بێگومان ژنەکەشی هەمان هەستی بەرامبەر بەو هەیە، کێ دەزانێ؟ ئایا ئەویش نەگۆڕاوە؟ ئایا هەمان هەمایۆنە میهرەبان‌و دڵسۆزو قۆزەکەی جارانە؟ ئایا ژنەکەی هەڵنەخەڵەتاندووە؟ باشە بۆ ئەم بیرانەی لا دروست ببوون؟ ئایا ئەنجامی بێ خەوی بوو یا زادەی یادی پڕ داخی دۆستەکەی؟ لەم کاتەدا دەرگا کرایەوە، کە نیزەکێکی عەبا بەسەر کاغەزێکی مۆرکراوی هێنا، دایە دەستی هەمایون‌و رۆیی.

هەمایون خەتە پچڕپچڕەکەی بارامی لەسەر زەرفی کاغەزەکە ناسییەوە. بە پەلە زەرفەکەی هەڵپچڕی، کاغەزەکەی لێ دەرهێناو دەستی بە خوێندنەوە کرد:

"نووکە کە سەعات‌و نیوێکی شەو تێپەڕیوە. ١٣ی مانگی مهر ٩٣٢، من بارام میرزای ارژن پور بە هەوەس‌و رەزای خۆم هەموو سامانی خۆم بەهوما خانمی مانگ ئاسا بەخشی.

"بارام ارژن پور".

هەمایون بەسەرسامی جارێکی دی نامەکەی خوێندەوە. ئەبڵەق و واقوڕماو کاغەزەکەی لە دەست کەوت. بەدری کە لە ژێرەوە چاوی لێی بوو، پرسی: "کاغەزی کێ بوو؟".

"بارام"

"چی نووسیوە؟"

"دەزانی چ سامانێکی هەیە بە همای بەخشیوە...."

"چەند پیاوێکی چاکە"

دەربڕینی ئەم سەرسامییە پڕ لوتفە، هەمایۆنی پتر لە ژنەکەی وەڕزکرد، بەڵام بێ ئیختیار نیگای لەسەر وێنەکەی بارام گیرسایەوە. پاشان گەڕایەوەو روانییە هوما. لە پڕ شتێکی بە بیرا تێپەڕی کە ئازای گیانی لەرزاند. وەك بڵێی پەردەیەکی دیکە لەبەرچاوی لاچوو: هومای کیژی بێ کەم و زیاد وەکو بارام بوو، نەبەمی کردبوو نە بە دایکی، چاوی شتاقیان رەش نەبوو، دەم بچکۆڵە، چەناگە باریك، رێك هەموو کەسمی دەموچاوی وەکو بارام بوو. هەمایۆن نووکە پەی بەوە برد کە بۆچی بارام ئەوەندە هۆمای خۆشویستوەو نووکەش لە پاش مەرگی سامانەکەی بەو بەخشیوە! ئایا ئەو هەموو خۆشەویستییەی ئەم منداڵە زادەی پێوەندی نهێنی بارام و ژنەکەی ئەم بووە؟ لەگەڵ هاوڕێیەکی گیانی بە گیانی خۆیدا؟ ژنەکەیساڵەها دەستی لەگەڵیا تێکەڵ بووە بێ وەی ئەو بزانێ و لە هەموو ئەم ماوەیەدا هەڵی خەڵەتاندووە. پێی رابواردووەو نووکەش ئەم وەسیەت نامەیە. ئەم جنێوی پاش مەرگەی بۆ ناردووە. نا نەیدەتوانی هەموو ئەم شتانە ئاسایی وەربگرێ، ئەم بیرانە وەکو بروسکە بە بەردەمیا رەت بوو، سەری کەوتە ژان، گۆناکانی خاوبوونەوە، نیگایەکی شەڕانی بڕییە بەدری و گوتی:

"تۆ چ دەڵێی، ها، بارام بۆ ئەم کارەی کردووە، چی خوشك و برای نەبوون؟"

"چونکە دوور لە ئێستا ئەم منداڵەی زۆر خۆش دەویست، وەختێ تۆ لەبەندەری گەز بووی، هوما سیرۆژەی گرت، دە شەوو رۆژ ئەم پیاوە بەدیار ئەم منداڵەوە وەستا، خوا عافوی بکا!"

هەمایۆن بە تووڕەیی گوتی: "نەخێر بەم سادەییەش نییە...."

"چۆن؟ خۆ هەموو کەسێك وەکو تۆ بێ رەحم نین کە سێ ساڵان ژن و منداڵەکەت بەجێ بێڵێی بڕۆی، وەختێ کە گەڕایتەوەش دەست لە گونان شۆڕتر، جووتە گۆرەوییەکیشت بۆ نەهێنام. دیاری دەست خاتر گرتن و قەدرزانییە، کە خاتری منداڵەکەی تۆی ویستووە یانی خاتری تۆی ویستووە دەنا عاشقی هوما نەببوو. ئەدی بەخۆت نەتدەبینی ئەم منداڵەی لە هەردووك چاوی پتر خۆش دەویست...))

((نا. راستیم پێ ناڵێی.))

((دەتەوێ چ بڵێم؟ تێ ناگەم...))

((خۆت گێل دەکەی..))

((یانی چی؟.. یەکێکی دی خۆی کوشتووە، یەکێکی دی سامان و سەروەتی خۆی بەخشیوە، من دەبێ حیساب و کیتاب بکەم؟))

((ئەوەندە دەزانم کە دەبێ تۆش بزانی!))

((دەزانی چییە، من سەر لە قسەی بە توێکڵ دەرناکەم، بڕۆخۆت معایەنە بکە، بیرت بلاوە، چیت لەمن گەرەکە؟))

((لات وایە من نازانم ؟))

((کە دەزانی بۆ لە من دەپرسیت ؟))

((بەسە. بەسە. تائێستا پێت رابواردووم!))

پاشان وەسیەتنامەکەی بارامی هەڵگرتەوە. گرمۆڵەی کرد و هاویشتییە

سۆپاکەوە، گڕی گرت و بوو بەخۆڵەمێش.
بەدری ئەو پارچە وەنەوشەییەی کەبەدەستیەوە بوو. توڕداو هەستا و گوتی:
(( باشە وا لەمن چووی بەقینا،  بەمنداڵەکەی خۆتشی ڕەوا نابینی؟))
هەمایۆن هەستا، پشتی بەمێزەکەوەداو بە تەوسەوە گوتی:
((منداڵی من... منداڵی من. ئەدی بۆ لە بارام دەچێ ؟))
ئانیشکی دا بەو چوارچێوەیەدا کە وێنەکەی بارامی تێدا بوو، و کەوتە سەر زەوی. منداڵەکە تائیستا خیشی کردبوو، کەوتە گریان. بەدری بەڕەنگی بزرکاو وسەدای پڕ لە هەڕەشەوە گوتی: ((مەبەستت چییە؟ دەتەوێ چ بڵێی ))
دەمەوێ بڵێم هەشت ساڵە هەڵت خەڵەتاندووم، پێت رابواردووم، هەشت ساڵە تفی سەرەو ژوور بوویت نەك ژن؟..."
لەگەڵ منتە...؟ لەگەڵ کچەکەمتە؟"
هەمایۆن بە پێکەنینێکی توڕەوە چوارچێوەی وێنەکەی نیشانداو بە هەناسە بڕکێوە گوتی:
"بەڵێ: کچی تۆ... کچی تۆ... کاکە ببینە. دەمەوێ بڵێم نوکە چاوم هەڵهات. بۆم دەرکەوت کە بۆچی سامانەکەی پێ بەخشیوە. بابێکی میهرەبان بووە، بەڵام تۆ بە قەولی خۆت هەشت ساڵەکە..."
"کە لە ماڵی تۆدا بووم. کە هەموو جۆرە رەنجێکم کێشاوە. کە بە کوێرەوەری کردمیت بە ماڵ، کە سێ ساڵان لێرە نەبووی پارێزگاری ماڵەکەتم کرد، پاشانیش هەواڵیان بۆ هێنام کە لە بەندەری گەز عاشقی ژنۆکەیەکی بێ سەروبەری رووسی بوو بووی. نووکەش ئەمە پاداشتی چاکەکەمە، چ هەنجەتێکت بەدەستەوە نییەو دەڵێی منداڵەکەم لە بارام دەچێ. بەڵام من چیدی ئامادەنیم... یەك دەقیقەی دی لەم ماڵە بەند نابم. وەرە گیانە... وەرە بڕۆین".
هوما بە رەنگی هەڵبزرکاوو ترسەوە دەیڕوانییە ئەم کێشمانە کێشە سەیرو بێ وێنەیەی نێوان بابی و داکی. بەدەم گریانەوە تەنورەکەی گرت و هەردووکیان بەرەو دەرگا چوون. بەدری لەبەر دەرگاکەوە دەستەیەك کلیلی لە بەرکی دەرهێناو بە توندی توڕی دان و لەبەر پێی هەمایۆندا کەوتەوە.
دەنگی گریانی هۆماو دەنگی پێ لە دالانەکە دوور کەوتنەوە، دوای دە دەقیقەیەك دەنگی پێچکەی عەرەبانەیەك هات کە ئەوانی بە نێو بەفرو سەرمادا برد. هەمایۆن مات و مەنگ لە جێی خۆی وەستابوو. دەترسا سەر هەڵبڕێ. نەیدەویست باوەڕ بەوە بکا کە ئەم ڕووداوانە ڕاستن. لە خۆی دەپرسی: رەنگە دین بووبێ یا خەونێکی ترسناك دەبینێ، بەڵام ئەوەی کە بەلایەوە روون و ئاشکرا بوو ئەمە بوو لەمەوپاش نەیدەتوانی لەم ماڵەدا بژی و هەڵبکا، ئیدی نەیدەتوانی هومای کچی کە ئەوەندەی خۆش دەویست بدینێ. نەیدەتوانی چیدی ماچی بکاو بیلاوێنێ، یادگاری رابوردووی هاوڕێکەی لەکەداربوو بوو. لە هەمووی خراتر ئەوە بوو ژنەکەی هەشت ساڵان بە پەنامەکی دەستی لەگەڵ یەکانە دۆستیا تێکەڵ کردبوو، ژیانی خێزانداری لەکەدار کردبوو، هەموو ئەمانەش بە دزی ئەوەوە ، بێ ئەوەی پێ بزانێ! هەر هەموویان ئەکتەری لێهاتوو بوون،

تەنیا ئەو خەڵەتاوەو پێیان رابواردووە. لە هەموو ژیانی بێزاربوو، بەرانبەر هەموو شتێك و گشت کەسێ دڵ کرمێ بوو. هەستی بە تەنیایی و نامۆییەکی گەورە کرد. چ چارێکی نەبوو جگە لەوەی خۆی نەقل بکا بۆ شارێکی دوور یا یەکێك لە بەندەرەکانی باشوورو باقی ژیانی لەوێندەر بقەتێنێ یا خۆی بکوژێت، بچێ بۆ شوێنێ کەس نەیبینێ، گوێی لە دەنگی کەس نەبێ، لە چاڵێکا رابکشێت و ئیدی هەڵنەسێتەوە. چونکە بۆ یەکەمجار هەستی کرد گێژاوێکی ترسناك لە نێوان ئەوو هەموو ئەو کەسانەی دەوروبەریا هەبووەو تا نووکە پەی پێ نەبردبوو.

جگەرەیەکی داگیرساندو بە ژوورەکەدا کەوتە هاتوچۆ، دیسان پشتی بە مێزەکەوەدا، کلۆ بەفرەکان لە پشت شووشەی پەنجەرەکەوە بە ئەسپایی و بەردەوام وەك ئەوەی لەسەر نەزمی مۆسیقایەکی سیحراوی سەما بکەن دەهاتنە خوارێ و دەنیشتنە سەر گۆیسەبانەکە. بێ ئیختیار یادی ئەو رۆژە خۆشانەی بیرکەوتەوە کە لەگەڵ دایك و بابیا دەچوونەوە بۆ گونەدەکەی خۆیان لە عێراق. بە رۆژەوە بەتاقی تەنێ لەسەر سەوزە گیای ژێر درەختەکاندا دەنووست، لەو شوێنەدا کە شێر عەلی سەبیلەکەی تێدەکردو لەسەر جەنجەڕەکە دادەنیشت و کچەکەی کە عەبایەکی سووری هەبوو بۆ ماوەی چەندین سەعات لەوێ را چاوەنۆڕی بابی دەکرد. باڵتەی جەنجەرەکە بە جیڕە جیڕ سواڵەی زێڕینی گەنمی قرچەشکێن دەکرد. نووکە وەزع و حاڵی ئەو رێك وەکو ئەو گایانە وابوو، نووکە دەیزانی ئەم ئاژەڵانە هەستیان بەچی دەکرد. ئەویش بە درێژایی ژیانی بە چاوی بەستراوەوە بە دەوری خۆیدا خولابووەوە، وەکو بارگیری دەوری ناعور، وەکو ئەو گایانەی کە خەرمانیان گێرە دەکرد، ئەو هەموو سەعاتانەی هێنایەوە یادی خۆی کە لە ژوورە بچوکەکەی گومرگدا دانیشتبوو و هەمان ئەو کاغەزانەی رەش دەکردەوە، هەندێ جار دەیڕوانییە هاوکارەکەی و باوێشکی دەدا، دووبارە دەستی دەدایەوە قەڵەم و هەمان ئەو نیمرانەی لە ریزی خۆیدا دەنووسین، بەراووردی دەکردن، کۆی دەکردنەوە، دەفتەرەکانی ژێرو ژوور دەکرد، بەڵام ئەوساکە تاقە دڵخۆشییەکی هەبوو، هەر چەندە دەیزانی کە چاوەکانی، بیری، لاوی و هێزو توانای بەرە بەرە دەتوێنەوە، بەڵام کەشەوان دەگەڕایەوەو بارام، کچەکەو ژنەکەی بە روو خۆشییەوە دەبینی هەموو هیلاکی لەشی دەردەچوو، بەڵام نووکە لەوانیش، لە هەر سێکیان وەڕەز بوو، هەر ئەوان بوون کەئەویان گەیاندبووە ئەم رۆژە.

وەك بڵێی لە پڕ بڕیارێکیدا، خۆی گەیاندە پشت مێزی نووسینەکەی، چەکمەجەی مێزەکەی راکێشا، حەوت تیرە بچووکەکەی کە هەمیشە لە سەفەراندا پێی بوو، دەرهێنا، جەربانەی فیشەکەکان لەجێی خۆبوون، تەماشایەکی نێو لوولە ساردو رەشەکەی کردو بە ئەسپایی لەسەر لاجانگی خۆی راگرت، بەڵام دەموچاوی لە خوێنا خڵتانی بارامی بیرکەوتەوە. ئەنجام دەمانچەکەی نایە گیرفانی.

هەستایەوە سەرپێ و لە داڵانەکەدا پاڵتۆکەی لەبەر کرد، پێڵاوە لاستیکەکانی لەپێکرد، چەترەکەشی هەڵگرت و لە ماڵ وەدەر کەوت. کوچەکە چۆڵ بوو. کلۆ بەفر بە ئەسپایی دەهاتە خوارێ. بێ وەی بزانێ کێوە دەچێ، کەوتە رێ، تەنیا ئەوەی دەویست لە ماڵەکەی خۆی، لەم هەموو رووداوە سامناکانە هەڵێ و دووربکەوێتەوە.

لە شەقامێکی ساردو سپی و خەمناکەوە سەری دەرهێنا، جێ پێچکەی گالیسکان لەسەر بەفرەکە نەخش ببوو. هەمایۆن بە ئەساپایی هەنگاوی هەڕاوی دەنا، ترومبێلێك تیژ تێپەڕ بە تەنیشتیا ڕەت بوو و بەفرو قوڕو چڵپاوی شەقامەکەی بەسەرو روویا پرژاند، وەستا، سەیرێکی جلەکانی کرد، لە قوڕو چڵپاودا هەڵکشابوون، ئەمەی پێناخۆش نەبوو، بگرە بەلایەوە جۆرە دڵنەواییەکی ڕۆحیش بوو، لە ڕێگادا تووشی کوڕیژگەیەکی شقارتە فرۆش بوو، گازی کرد. شقارتەیەکی کڕی، بەڵام کە دیقەتی روخساری کوڕیژگەکەی دا سەیری کرد چاوەکانی ڕەش، لێوی تەنگو قژی زەرد بوو. بارامی بیرکەوتەوە، تەزوویەکی پێداهات و ملی ڕێگای گرت. لە پڕ لەبەر جامخانەی موغازەیەکا وەستا. چووە بەرەوە، هەنیەی بە شووشە ساردەکەوە چەسپاند. خەریك بوو کلاوەکەی بەربێتەوە، ئەسباب وازی دنیا لە نێو جامخانەکەدا ڕێز کرابوون. بەسەری قۆڵی کەوتە سڕینەوەی بوخاری سەر شووشەی جامخانەکە، بەڵام ئەم کارە بێهودە بوو، بووکۆکەیەکی گەورەی دەموچاو سووری چاوشین-ی دەم بەبزە لەبەر دەمیا بوو، قەیرێ بەماتی تێی ڕوانی، لەبەر خۆوە بیری کردەوە ئەگەر ئەم بووکۆکەیە هی هۆما بایە چەندی پێ خۆشحاڵ دەبوو.

موغازەچییەکە دەرگاکەی کردەوە، هەمایۆن کەوتەوەڕێ، بەیەك - دوو کۆڵانی دیدا تێپەڕی. لە ڕێگادامامر فرۆشێکی بینی کە لە پاڵ سەبەتەکەیا دانیشتبوو سێ مامرو کەڵەشێرێك کەلاقیان پێکەوە بەسترابوون، لەسەر سەبەتەکە دانرابوون، لاقە سوورەکانیان لەسەرمانا دەلەرزین. لە تەنیشتییەوە پەڵە خوێنی سوور ڕژابووە سەر بەفرەکە، نەختێ لەولاترەوە کوڕیژگەیەکی کەچەڵی قۆڵ و بازوو لە کراسی دڕاوەوە دەرهاتوو لەبن بانیژەی ماڵێکا دانیشتبوو.

هەموو ئەمانە سەرنجیان ڕاکێشا، بەڵام نەیدەزانی لە کوێیەو بۆ کوێ دەچێ، هەستی بە بارینی بەفرەکە نەدەکرد، چەترەکەی هەر بە دادڕاوەیی بە دەستەوە بوو، خۆی بە کۆڵانێکی چۆڵی دیدا کرد، لەسەر سەکۆی بەر ماڵێکدا ڕۆنیشت. بەفر توندتر ببوو، چەترەکەی هەڵدا، شەکەتی تینی بۆ هێنابوو، سەری قورس ببوو. چاوەکانی بە ئەسپایی وێك هاتنەوە.

دەنگی ڕێبوارێك وەئاگای هێنایەوە، هەستا، دنیا تاریك ببوو. هەموو شتەکانی ئەو ڕۆژەی وەبیر خۆی هێنانەوە. کوڕە کەچەڵە شرۆڵەکە، لاقی سووری مامرەکانی سەر سەبەتەکە کە لەسەری هەڵدەلەرزین، ئەو پەڵە خوێنانەی ڕژابوونە سەر بەفرەکە. هەستی کرد کەمۆکەکی برسییە، کێکێکی لە دوکانێکی شیرینی فرۆشدا کڕی، بەڕێوە دەیخواردو وەکو تارماییەك بێ اختیار بە کۆڵانەکەدا دەسووڕایەوە.

کە خۆی بە ماڵێدا کرد، سەعات دووی سەر لە بەیانی بوو. وەکو مەیت خۆی دەنێو کورسییەکە خزاند. پاش سەعاتێك لەسەرما خەبەری بۆوە، هەر بە جلەکانییەوە چووە نێو جێگای نووستنەوە، لێفەکەی ڕاکێشایە سەر خۆی، خەونی بینی، لە خەویا هەمان کوڕیژگەی شقارتە فرۆش جلێکی ڕەشی لەبەر کردبوو و لە پشت مێزێکەوە کە بووکۆکەیەکی گەورەی لەسەر بوو دانیشتبوو. بووکەکە چاوشین، لێو بەخەندە سێ کەس دەستەو نەزەر لەبەردەمیا وەستابوون، هومای کیژی ئەو بە مۆمێکەوە وەژوور کەوت. دوای ئەو پیاوێك وەژوورکەوت، دەموچاوە سپییەکەی بەڕووپۆشێکی سپی خوێناوی داپۆشرابوو، چووە پێشەوە دەستی کوڕە شقارتە

فرۆشـەکەو هومـای گـرت، کـە ویسـتی لـە سـڤدەری دەرکـەی بچـێتە دەرێ دوو دەسـت کـە رووی حـەوت تیرکێـان کردبـووە ئـەو لـە پشـت پـەردەوە دەرکـەوتن. هـەمایۆن بـەترس و ژانەسـەرێکی ناخۆشەوە لە خەو راپەڕی.
دوو هەفتەی ژیانی وی بەو تەرحە تێپەڕین، بە رۆژەوە دەچووە دایەرەو شەوانی درەنگ بۆ خەو دەگەڕایەوە ماڵێ. هەندێ عەسران بە خۆشی نەدەیزانی چۆن رێی دەکەوتە گوزەرێکی نزیکی قوتابخانەیەکی کچانە کە هومای کیژی لەوێندەر بوو.
کە زەنگی پشوو لێی دەدا، لە پێچێکاو لە پەنای دیواری قوتابخانەکەدا خۆی مات دەدا، دەترسا لەوەی کە مەشهەدی عەلیی نۆکەری ماڵی خەزووری بیدینێ، چاوی بەیەك بەیەکی منداڵەکاندا دەگێڕا، بەڵام هومای کچی نەدەبینی.
موافەقەی نەقڵەکەی هاتەوەو دایەرەی گومرگی کرماشانی بۆ دیاری کرا.
هەمایۆن رۆژێك بەر لە رۆژیشتن هەموو کاروبارێکی خۆی رێکخست. چووە گەراج، ترومبیلەکەی بینی، بلیتی سەفەری بڕی، بەڵام لەبەر ئەوەی جانتاکانی نەبەستبوون و خاوەن گەراجەکەش پێی داگـرت کـە ئـەو ئێوارەیـە فریاناکـەوێ، سـەفەرەکەی لـە بـری هـەمان ئێـوارە دواخسـت بـۆ سـبەی بەیانی.
کە وەژوور کەوت یەکسەر چوو بۆ ئەو ژوورەی کە مێزی نووسینەکەی خۆی تێدا بـوو. ژوورەکە شـێواوو پێکـادراو، خۆڵەمێشـێکی سـارد لەبـەر سـۆپاکەدا رژابـوو. پارچـەیەکی وەنەوشـەیی ئاوریشـم چـن و ئـەو زەرفـەی کـە وەسـیتنامەکەی بـارامی تێـدابوو. لەسـەر مێزەکـە دانرابـوون. زەرفەکەی هەڵگرت و دڕاندنی، بەڵام پارچە کاغەزێکی نووسراوی تێدا دیت کە ئەو رۆژە لەبەر پەلەکردن بەرچاوی نەکەوتبوو. پاش ئەوەی پارچە کاغەزەکانی لەسەر مێزەکە خستنەوە پاڵ یەك، ئەمەی خوێندەوە:
"بێگومان پاش مەرگم ئەم کاغەزەمت دەگاتێ. دەزانم سەرت لەم بڕیارە کوت و پڕەی من سووڕ دەمـێنێ، چـونکە چ کـارێکم بـەبێ راوێـژی تـۆ نـەدەکرد. بـەڵام بـۆ ئـەوەی چ رازو مـەرامێك لـە نێوانماندا نەبێ دان بەوەدا دەنێم کە من بەدری ژنتم خۆش دەویست. چوار دانە ساڵ بوو لەگەڵ خۆدا دەجەنگیم، ئاقیبـەت زاڵ بـووم و بـۆ ئـەوەی خیانـەتم لـە تـۆ نـەکردبێ دێـوە سـەر شێتەکەی ناخی خۆم کوشت. شتێکی ناچیز پێشکەش بە هوما خانم دەکەم هیوادارم قەبووڵ بکرێ!
دڵسۆزتان بارام-"
هـەمایۆن قـەیرێ بـە مـاتی و مـەنگی روانییـە ژوورەکـە. نووکـە خاترجـەم بـوو کـە هومـا منـداڵی خۆیەتی. ئایا دەیتوانی بێ ئەوەی هوما بدینێ بڕوا؟ کاغەزەکەی دووبارەو سێ بارە خوێندەوەو لـە بـەرکی نـاو لـە مـاڵ وەدەرکـەوت. لـە رێگـا بـێ دوودڵـی خـۆی بـە موغـازەی ئەسـباب وازی فرۆشەکەدا کرد. بووکۆکە گەورە دەموچاو سوورە چاوشینەکەی کڕی و بەرەو ماڵی خەزووری کەوتە رێ. کە گەییە وێندەر لە دەرکەیدا: کە مەشهەدی عەلی نۆکەریان هەمایۆنی بینی بە چاوی گریاناوییەوە گوتی:
"قوربان، چ قوڕێکم بەسەرا کرا؟ هوما خانم!"

"چی لێهاتووه؟"

"قوربان تۆ نازانی هوما خانم له دووری تۆ چەند بێ قەراری دەکرد. هەموو ڕۆژێ بەخۆم دەمبرد بۆ قوتابخانە. ڕۆژی یەك شەممە بوو. یانی ئەوە پێنج ڕۆژە کە عەسرەکەی لە قوتابخانە هەلات، گوتبووی دەچم بۆ کن بابە گیان. ئێمە زۆر شپرزە بووین. چما محمد پێی نەگوتییت؟ تەلەفۆنمان کرد بۆ مەرکەز، من دوو جاران هاتم بۆ ماڵتان"

ئەوە چ دەڵێی؟ چی بووە؟"

هیچ قوربان، درەنگە شەوانێ بوو کە بۆیان هاوردینەوە، ڕێی وێڵ کردبوو. لەسەرما نەخۆش کەوت. تا گیانی سپارد هەر تۆی گاز دەکرد. دوێنێ بردمان بۆ شا عبدالعظیم، لەپاڵ قەبرەکەی بارام میرزاوە ناشتمان".

هەمایۆن بەسەرسامی و حەپەساوی دەیڕوانییە مەشهەدی عەلی، لەم دەمەدا بووکۆکەکەی لێ بەربووەوە. پاشان وەکو دینان یەخەی پاڵتۆکەی هەڵدایەوەو بە پەلە بەرەو گەراج ڕۆیی. چونکە لە بەستنی جانتاکانی ببۆوە دەیتوانی بە ترومبێلی عەسر تا زووتره لەوێ بڕوا.

***


**سەرچاوە: عبد العلی دستغیب**

* قصة نويسي / رضا براهني

**چاپ چهارم** نشر البرز/ تهران / ١٣٦٨ ل ٤٨١- ٤٨٨

*ادبيات داستاني
قصة، رمانس، داستان كوتاه، رمان
جمال مير صادقي
تهران ١٣٧٦ **چاپ** سوم
* صد سال داستان نويسي ايران
حسن مير عابديني
**چاپ** اول ١٣٧٧ ل ٥٥-٨٠ و ل١٠١-١٠٤
* خلاصة داستاني كوتاه فارسي أز آغاز تا امروز
محمد باقر رضايي / **چاپ** اول ١٣٧٨
* صادق هيدايت و **مرگ** نويسنده:
دكتر محمد علي همايون كاتوزيان
**چاپ** دوم ١٣٧٤ نشر مركز
* يوسف اسحاق **پور**. برمزار صادق هيدايت، ترجمة باقر **پرهام**
تهران، باغ آيينة ١٣٧٣

*** حەمە کەریم عارف، ئەودیوی مەرگ، چاپی ٢٠٠١ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ل٣١-٥٦**

## حەمە کەریم عـارف

- **کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.**
- **لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.**
- **یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری ساڵی ١٩٧٣ بڵاوبووەتەوە.**
- **لە ساڵی ١٩٧٦ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.**
- **سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢٠٠، گۆڤاری نەوشەفەق.**

- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئالای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع بەرهەمی بلاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە سالی ١٩٧٤ - ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ سال، بێ وابەستەگی حیزبی، پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆلەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بلاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانە لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بلاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٣- بەیداخ، چیرۆك، ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەلە چیرۆك، چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گولان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٢
٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٣ دەزگای ئاراس
٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، یەك چاپ (شاخ)
١٠- شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)
١١ - هاومالەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٠ گولان
١٢- بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، ٣ چاپ شاخ، شار ٢٠٠٣
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دووره ولات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گولان
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی، چاپی شاخ

١٩- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عزیز شەریف
٢٠- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ
٢١- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە، چاپی شاخ
٢٢- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی شێیەم ٢٠٠٤ دەزگای ئاراس
٢٣- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان
٢٤- گوزارشتی مۆسیقا، د. فۆاد زەکەریا.
٢٥- دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.
٢٦- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٢٧- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٢٨- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە، مالرۆ.
٢٩- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣٠-بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣١- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٣٢- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.
٣٣- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری.
٣٤- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، چاپی یەکەم ١٩٩٨ وەزارەتی رۆشنبیری.
٣٥- هونەر و ژیانی کۆمەلایەتی، پلیخانۆڤ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ دەزگای موکریانی
٣٦- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، ئیڤلین رِیید.
٣٧- لێکدانەوەیەك لە مەرِ نامۆ، لویس ریی.
٣٨- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٣٩- فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٠- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤١- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٢- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە.
٤٣- کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (٢٣ ئەفسانە)
٤٤- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف، چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای موکریانی
٤٥- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٤٦- جیّ پیّ، کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت، جەلال ئال ئەحمەد، بوزرگی عەلەوی، سادقی چوبەك، مەنسوری یاقوتی)
٤٧- چیرۆکستان، کۆمەڵێك دەق و رەخنە، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ نووسەرانی کەرکووك
٤٨- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی، چاپی یەکەم (٢٠٠٠) حەمە کەریم عارف
٤٩- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی - کوردی) حەمە کەریم عارف

**٥٠- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) وەزارەتی رۆشنبیری**

**٥١- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە**

**٥٢- چزیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس**

**٥٣- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.**

**٥٤- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.**

**٥٥- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی**

**٥٦- گوگول، نووسەری ریالیست**

**٥٧- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی**

**٥٨- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی**

**٥٩- خافرو غ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی**

**٦٠- رێبازە هونەرییەکانی جیهان**

**٦١- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) دەزگای سپیرێز**

**٦٢- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان**

**٦٣- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف**

**٦٤- دیدار و دەق و رەخنە.**

**٦٥- دیداری چیرۆکڤانی.**

**٦٦- قوتابخانە ئەدەبییەکان، رەزا سەید حسەینی.**

**٦٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف**

**٦٨- هەزار تۆپی شیعری نوێخوازی و چەند باسێکی دی، حەمە کەریم عارف.**

**٦٩- کورد لە سەدەی نۆزدە و بیست دا، کریس کۆچرا، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران**

*** لە راپەرینەوە تا نەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات و بەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاو دەکاتەوە..**

*** ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، ئامادەیە بە خۆڕایی پێشکەشیان بکات و...**